کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا

# کورد و کوردستان

## لە سەفەرنامەی بازرگانی ڤینیسیاییدا

رابیعە فەتاح شێخ محەمەد



٣

# کورد و کوردستان
# له سەفەرنامەی بازرگانی ڤینیسیاییدا

## سەرەتای سەدەی شازدەی زایینی

## تۆژینەوەیەکی مێژووییە

رابیعە فەتاح شێخ محەمەد

**کورد و کوردستان لە سەرچاوە مێژووییەکاندا (٣)**



## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە


- **کورد و کوردستان لە سەفەرنامەی بازرگانی ڤینیسیاییدا**
- **نووسینی: رابیعە فەتاح شێخ محەمەد**
- **سەرپەرشتیاری پرۆژە:** رابیعە فەتاح شێخ محەمەد
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٤**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٢٢٧)ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٣٣)**

www.mukiryani.com :**ماڵپەڕ**

info@mukiryani.com :**ئیمەیل**

# ناوەڕوك

## پێشەکی:

لە راستیدا گەشتنامە یەکێکە لەو سەرچاوە گرینگانەی کە مێژووی میللەتانیان تۆمارکردووە، گەلێ گەشتیاریش لە ماوەی جودا جودا بە کوردستان تێپەڕیوون و بەرهەمەکانیان بووەتە سەرچاوەی گرینگ بۆ مێژووی کوردستان.

بازرگانی ڤینیسیایی لە ماوەیەکی هەستیاردا سەردانی کوردستانی کردووە، چونکە لە لایەکەوە زلهێزێکی وەکو سەفەوی هاتۆتە گۆڕەپانی سیاسییەوە و مەزهەبی شیعەگەریی سەپاندووە، لەلایەکی دیکە دەوڵەتی عوسمانی بۆ فرەوانخوازی رووی لە کوردستان و رۆژهەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی کردووە.

ئەم تۆژینەوەیە بە پلەی یەکەم پشتی بە خودی سەفەرنامەی بازرگانی ڤینیسیایی بەستووە، رەنگە بە قەبارە، سەفەرنامەکە هێندە زۆر نەبێ، بەڵام بۆ مێژووی کورد، ئەم بابەتانەی باسی کردوون، یەکجار گرینگن، نەخاسمە لە سەردەمێکی هەستیاردا سەردانی کوردستانی کردووە.

تۆژینەوەکە لە دەستپێکێك و حەوت بەش پێکهاتووە، جێگەی سەرنجدانە، ئەوەی لە سەفەرنامەکە بە دوور و نێزیك پێوەندیی بە کوردەوە هەبێ، تا ئەوپەڕ هەولم داوە سەرنجەکەی بخەمەڕوو، دواتر بەراوردی بکەم و روونی بکەمەوە، لە دەستپێکدا و بە کورتی ئاماژە بە سەردەمی هاتنی بازرگانی نەناسراو دراوە، هەرچی بەشی یەکەمە لە سەفەرنامەکە وەکو کتێب باسکراوە و روونکراوەتەوە لە چەند بەش پێکهاتووە و ئاماژە بە سەرچاوەکانی سەفەرنامەکە کراوە.

لە بەشی دووەمدا روانینی بازرگان بۆ کورد خراوەتە روو، کە دەتوانین بڵێین ئەو بەشە جێگەی تایبەتی هەیە، چونکە ئەو روانینە سەرباری ئەوەی تەماشاکردنی بێگانەیەك بۆ کورد دەخاتە روو، هەروەها هەندێ خاڵی سیاسی گرینگ لەو روانینە بۆ داهاتوو روون دەکاتەوە، لە بەشی سێیەمدا لا بە لا باسی پێوەندیی کورد و سەفەوی لەسەردەمی رووخانی دەوڵەتی ئاق قۆیۆنلو کراوە، کە بازرگان بە وردی چەند خاڵێکی گرینگی خستۆتە روو، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ زانیاریی نوێ لەبارەی میرنشینە کوردییەکان دەرخستووە.

لە بەشــی چــوارەمدا بازرگــانی نــاوبراو وەك ولآتناســێك قــەلآ و شــارو شــارۆكە کوردییەکانی ناساندووە و باسی دانیشتووانیشی کـردووە، هەرچـی بەشـی پێنجەمـە بەشێوەیەکی گشتیی باسی لە بازرگانی، کشتوکاڵ و باخـداری کـردووە، لـەم رووەوە هەندێ سەرنجی پچڕپچڕی خستۆتەڕوو، لە بەشی شەشەمدا باسی لە چەندین کلێسا و هەتا رادەیەك هەندێ بیروباوەڕی ئاینی بە شێوەیەکی کـورت کـردووە، هــەروەها لــە دوابەشدا باسی لە سەرچاوەکانی ئاو خواردنەوەی قەلآ و شارە کوردییــەکان کـردووە، هەروەها لەبارەی تەندروستییەوەش کۆمەڵێك سەرنجی خستووەتە ڕوو.

بۆ ئــەم تۆژینەوەیــەش پشــت بــە چــەندان سەرچــاوەی جۆراوجــۆر بەســتراوە، لــە پێشەوەی هەمووشیان خودی کتێبی سەفەرنامەی بازرگانی ڤینیســیاییە بــە زمــانی ئینگلیزی، ئینجا بە زمانی فارسی، ئەمەش بۆ ئەوە بووە تاکو سوود لە سەرنجەکانی وەرگێڕی فارسیش وەربگرین، بە تایبەتی لە چاپی دووەمدا پێداچــوونەوەی وردی بــۆ کــراوە و چــەندین پــەراوێزی بــە ســوودی بــۆ نوســراوە، لــە پــاڵ ئــەوەدا کتــێبی شەرەفنامەنەش سوودی لێ وەرگـیراوە، لەبەرئــەوەی هــەردوو سەرچــاوەکە لــە رووی مێژووییــەوە لــە یــەك نێــزیکن، بۆیــە هەوڵــدراوە ئــەوەی لــەبارەی کــوردەوە لــە سەفەرنامەکەدا هەیە لەگەڵ کتێبەکەی شەرەفخانی بەدلیسی بەراورد بکرێ، ئەمەش زۆر سوودی بە تۆژینەوەکە گەیاندووە، هەروەها سوود لــە چــەندان کتــێبی دیکــەش وەرگیراوە لەوانە کتێبــە بــە ســوودەکەی ئــەبو بــەکر تــارانی (دیــار بەکرییــە)، کــە سەرچاوەیەکی گرینگی سەردەمی ئاق "قۆیۆنلو"ــە، تارانیش مێژوونووسی دەربــاری ئاق بووە، هەروەسا ســیاحەتنامەی ئــەولیای چــەلەبیش دوای بازرگــانی ڤینیســیایی زۆرینەی کوردستان گەڕاوە و سیاحەتنامەکەی زانیــاریی زۆر گرینگــی تێدایــە و بــە وردی سەرنجی لە بواری سیاسی، جوگرافی، کۆمەلآیەتی و ئاینی کوردســتان خســتۆتە روو، سەرباری چەندین سەرچــاوەی دیکــە. هــەروەها چــەندان ژێــدەری دیکــەش لــە تۆژینەوەکەدا سوودیان لێ وەرگیراوە.

## دەستپێك:

گەشتیارانی ڤینیسیایی بەر لە گەشتیارانی دیکەی رۆژئاوا یەك لەدوای یەك بەتایبەتی لەسەدەی (٩-١٠ك/١٥-١٦ز) سەردانی کوردستان و ئێرانیان کردووە، ئامانج لەم سەردانانەش ئەوە بووە، تا گووشاری دەوڵەتی عوسمانی بەسەر رۆژئاوا بەگشتی و خۆیان بەتایبەتی کەم بکەنەوە، لەبەرئەوەی ئەو شەش گەشتیارە ئیتاڵییەی کە سەریان لە ئێران داوە چواریان باڵیۆزی کۆماری ڤینیسیاییا بوون، بەمەبەستی هاوپەیمانی سیاسی لەگەڵ ئاق قۆیۆنلو هاتوونەتە دەرباری سوڵتان ئوزون حەسەن (٨٥٧-٨٨٢ك /١٤٥٣- ١٤٧٧ز)[١] لەوانە جوزافا باربارۆ، کاترینۆ زینۆ، کۆنتارینی، هەروەها بازرگانی ڤینیسیایی بۆ خۆشی لە یەکێك لە شالاوەکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی چل رۆژ لە ئەرزنجان ماوەتەوە[٢].

لە راستیدا هەرچەندە شالاوی عوسمانی بۆ ئەورووپا زیاتر دەبوو، ولاتانی ئەورووپایی لەسەروبەندی رێنیسانسدا[٣] بە جۆرێك دەکەوتنە خۆیان تا مەترسی

١- ئوزون حەسەن: نەوەی عوسمان قەرەیولوکی سەرداری خێڵی ئاق قۆیۆنلوە، پاش ململانێی نەوەکانی قەرە یەلوك لەسەر دەسەلات، توانیی لە هەرێمی دیاربەکر و دەوروبەری سەرەتا سەرداریی خێڵەکە بکات و ناوچەیەك دابڕێنێ و بەرە بەرە خۆی بەهێز بکات، تا لە ساڵی ٨٧١ك/١٤٦٦ز سەرەتا دەسەلاتی جیهانشای ئاق قۆیۆنلوی لەناوبرد، پاشان لە ساڵی ٨٧٣ك/١٤٦٨ز توانیی بەسەر سوڵتان ئەبوسەعیدی نەوەی تەیموری لەنگ زاڵ بێ و هەموو ئێران بخاتە ژێر دەسەلاتی و لە تەورێز دەوڵەتی ئاق قۆیۆنلو رابگەیەنێ، تا لە ساڵی ٨٨٢ك/١٤٧٧ز کۆچی دوایی کرد و یەعقوبی کوڕی دوای ململانێیەکی کورت جێگەی گرتەوە.ب ڕوانە کتێبی دیاربکریە، رابیعە: کوردستان لە سەدەی پازدەی زانییدا، ل١٦٤-١٨١.

2-- MERCHANT of VINCE and others: A NARRATIVE of ITALIAN TRAVELS in PERSIA, Translated by Charles Gery, BURT FRANKLIN PUBLISHER, U.S.A, NEW YORK, N.D. p.141

٣- رێنیسانس: واتە سەردەمی بووژانەوە، سەرەتا ئیتاڵیا رۆڵی پێشەنگی هەبوو لەو بزووتنەوەیەدا، کە روانینی سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست بەلاوە بنێنن و بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی بەهاکانی یۆنانی و گەشەی پێبدەن، لە ئیتاڵیا ریشەکانی لە بواری شیعر و هونەر دا دەستی پێکرد، لێتوژان پێیان وایە کەوتنی قوستەنتینیە لە ساڵی ١٤٥٣ز لە رووی سیاسییەوە سەرەتای قۆناخی نوێیە. رێنیسانس لەرۆژئاوادا درێژەی کێشا و زۆرینەی زۆری بەرهەمی هزری و ئەدەبی و زانست و بوارە فرەوانەکانی دیکە لە رێنیسانسەوە سەریان

عوسمانی لەسەرخۆیان لابدەن، دەوڵەتەکانی ئیتاڵیاش لە کاتێکدا بیریان لە سنووری ڕۆژهەڵاتی عوسمانی کردەوە تا خەریکی بکەن، ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ ئەو سیاسەتە نوێیەی ئەو وڵاتانە پێڕەویان دەکرد. هاتنی گەڕیدەکاتنیش لە ڕۆژئاواوە بووە تا ڕۆژهەڵات پاش یەکەمین جەنگی جیهانی بەردەوان بوو، دواتر ڕۆژنامەنووسان ئەو کارەیان ئەنجام دا[1].

دەتوانین بڵێین گەڕیدە و باڵیۆزانی دەوڵەتی ڤینسیا سەرمەشقی ئەو سیاسەتەن، کە ڕۆژئاوا گرتووتیەبەر، لە کاتێکدا ئەو وڵاتانەی سنووری ڕۆژهەڵاتی عوسمانی، هەرچییەك بن، ڕۆژئاوا بە شێوازی خۆی سەودایی لەگەڵ کردووە، بازرگانی ڤینیسایش هەرچەندە بازرگان بووە، بەڵام سەفەرەکەی لە مەبەستی سیاسی بەدەر نەبووە، خۆی ئاگەداری بارودۆخی سیاسی ناوچەکە و مەترسییەکانی عوسمانی بووە.

---

هەڵدا، هەتا کۆمەڵگەی لە قۆناخی دەرەبەگی بۆ بورژوازی گواستەوە و مرۆڤەیل سوودێکی زۆریان لە ئەنجامەکانی وەرگرت. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: جیمز ا کوریك: رنسانس،ترجمه: ازیتا یاسائی،تهران١٣٨٨ ه.ش، چاپ هفتم، انتشارات ققنوس.

١ - بڕوانە: سفرنامه اوربیان به ایران، ژان شیبانی، ترجمه:سید چیاالدین دهشیری، تهران ١٣٨٤ ه.ش، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ سوم.

## ١ . سەفەرنامەکە:

نووسەری گەشتنامەی بازرگانی ڤینسیایی بۆ ئێران، بازرگانێکی نەناسراوی ئیتاڵی خەڵکی شاری ڤینسیایە، لە ساڵانی (٩٢٣-٩٢٦ك / ١٥١٧-١٥٢٠ز) گەشتنامەکەی نووسیووە. میرێلا گەلێتی لە ریزی کتێبە چاپکراوەکان باسی کردووە، لەگەڵ ئەوەی دیار نییە ناوی خۆی و بابی یان نازناوی چییە، هەروەها ساڵی مردن و لەدایکبوونیشی نەزانراوە(٢)[١]. ئەم گەشتە لەژێر سەردێری( گەشتی بازرگان بۆ ئێران) بڵاوکراوەتەوە، کە برێتییە لە بیست و دوو چاپتەر، هەر چاپتەرێکیش ژمارەی خۆی بۆ دانراوە، دوای ژمارەکەش نووسەر بە کورتی، بەچەند دێرێك چاپتەرەکەی ناساندووە. گەشتی بازرگانی ڤینیسیایی هەشت ساڵ و هەشت مانگی خایاندووە، باسی ساڵی (٩١٢-٩١٣ك/١٥٠٧ز) کردووە، کە لەگەڵ سوپای شا ئیسماعیلی سەفەوی بووە، کە هێرشی کردۆتە سەر عەلائولدەولەی قارەمانی، جێگەی سەرنجە لە کۆتاییەکانی گەشتەکەیدا بەگەڵ سوپای شا ئیسماعیل کەوتووە، کەواتە چەند ساڵێك بەر لەم ڕێکەوتە گەشتەکەی دەست پێکردووە. سەبارەت بە شارە گەورەکان و خەڵك و دابونەریتیان بە تایبەتی ئەوانەی پێیایدا تێپەڕ بووە زانیاریی داوە[٢].

١ - کورد و کوردستان لە نووسراوەکانی ئیتاڵی دا لە سەدەی (سێزدەم ـ نۆزدەم ز)، وەرگێڕانی: جاسم تۆفیق، پێداچوونەوەی: سەلاح ڕێبوار. ستوکهۆڵم، ١٩٨٧، بنکەی هەنگاو بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری کوردی. نووسەر ئاماژەی بەوە داوە، سەرەتا بەزمانی ئیتاڵی لەگەڵ چەند گەشتنامەکەیەکی دیکە چاپ کراوە، لەبارەی چاپکردنی گەشتنامەکە بەزمانی ئیتاڵی بۆ یەکەمجار بەم شێوەیە لە لاپەرە (٣٩) ئاماژەی پێداوە.
viaggio dun mercamte che fu nella Persia, in: Ramusio. [della Anonimo navigazione et viagg] Venetia, nella stamperia dei Giunti, 1563- 1606,[Vol.3],11,pp.78-91.

2- - MERCHANT of VINCE, Op.cit, p.141

ميرنشيني قارةماني: ميرنشينيَكي توركمانيية لة سالَي (٦٥٤ك/ ١٢٥٦ز)دا لة لايةن ميرةكاني ثاشماوةي سةلجوقيية كانةوة دامةزراوة، لة ناوضةكاني (ئارمناك و لارندةو قونية) و دةوروبةري حوكميان كردووة، بوونةتة جيَطةي ضاوتيَبرِيني دةولَةتي عوسماني و دةولَةتي مةماليك، تا دواجار لة سالَي (٨٨٨ك/ ١٤٨٣ز) دا بة دةستي سولَتان محةمةد فاتيح كؤتايي بة دةسةلآتيان هات. ستانلي لين بول: الدول الاسلامية، ترجمة: محمد صبحي فرزات، دمشق، ١٩٧٤، قسم ٢،ص٤٣٥-٤٤٠ .

له هەر بیست و دوو چاپتەری گەشتنامەکەدا، لـە چـاپتەری یەکەمــەوە  تـاکو شەشەم بە تەواوی باسی لە دەڤەرەیلی کوردســتانی کـردووە. چـاپتەرەکانی دیکـەش باسی لە تەوریز و باج وەرگرتن و دەسەلاتی هــەردوو ســولتانی ئـاق قۆیونلـو ئـوزون حەسەن و یەعقوبی کوری (٨٨٣-٨٩٦ك /١٤٧٨-١٤٩٠ز ) و سەرهەلدانی سەفەوی و بلاوبوونەوەی لە کوردستان کردووە، جێگەی باسە چاپتەری حەڤدەی تەرخان کردووە بە حەسنکێف[1] هەرچەندە گەشتەکەش بە پلەی یەکەم بە مەبەستی بازرگانی بووە، بۆ خۆی چوارچێوە و مەبەستی گەشتەکەی دیارکردووە، کە ماوەیەك لە تـەواوی ولات و شار و شارۆکە و قەلاکانی نێوان حەلەب و تەوریز و لە تـەوریزەوە تـا دەربەنـد و تـا لێوارەکانی دەریای مازەندەران (خـەزەر) بەسـەربردووە و بازرگـانیی کـردووە، بـەلام ناکرێ لە مەبەستی سیاسیش داببڕێ، سەرباری ئەوەی بازرگانی ڤینیسیایی باسی لـە چالاکی بازرگانی خۆی کردووە، هەروەها باسی لەوە کردووە، ئەگەر تۆپـەکانی ئێمـە (ڤینیسیایی) بگەیشتبایە ئوزون حەسەن، ئەوا لە ململانێی لەگەل دەولەتی عوسمانی نەدەشکا، کە دەولەتی  عوسمانی مەترسی بەسەر ئەورووپا رۆژ بـە رۆژ لـە زیـادبوون دابوو[2].

---

1 - Ibid p.141,142,145,149,155, 159,194.

2 - Ibid, p.143.182

منوچهر دانش پژوه. بریسی سفرنامەهای دوره صـفوی، انتشـارات دانشـکاه، اصـفهان، فرهنگسـتان هنـر، پاییز١٣٨٥ ه.ش،ص١٨- ١٧. هەروەها لەبارەی ململانێی سولتان محەمەد فاتیحی عوسمانی و ئوزون حەسەن، بگەرێوە: حسن روملو:احسن التواریخ، به اهتمـام: عبدالحسـین نـوائی، بنگـاه ترجمـه ونشـری کتـاب،تهران، ١٣٤٩ه.ش، ج ١١،ص٥٢٤-٥٢٥. رابیعــە فــەتاح: کوردســتان لــە ســەدەی پــازدەی زایینییــدا،وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٥ ،ل١٧٨-١٧٩.

## ب . سەرچاوەکانی گەشتنامەکە:

بازرگانی ڤینیسیایی هەر تەنها باسی ئەو ماوەیەی نەکردووە، کە خۆی لە کوردستان و ئێران بە سەری بردووە، بگرە لە گرینگترین رووداوەکانی ناوچەکە لە ماوەی ئوزون حەسەن تا کۆتایی گەشتەکەی دواوە، سەرچاوەکانی بەم شێوەیە دابەش دەبن:

### ١- بینین:

گەشتنامە بۆ خۆی تۆمارکردنی ئەو رووداوانەیە، کە پتر لە رێگەی (بینین)ـەوەن، لەبەرئەوە بینین سەرچاوەیەکی گرینگی کتێبەکەی پێکهێناوە، چونکە ئەو رووداوە سیاسییانەی خۆی بینیویەتی تۆماری کردوون، هەروەها لە رووی جوگرافیای مێژووییەوە، پێناس و ماوەی نێوان شار و قەڵاکانی تۆمارکردووە. لەسەرەتاوە گوتویەتی: "پێویستە خوێنەران دڵنیا بن لەوەی دیومە و بیستوومە، هەر ئەوەم وتووە" چونکە بۆ خۆی لەگەڵ لەشکری شا ئیسماعیل بووە لە ئەرزنجان[١].

حەزی کردووە بگەڕێ تا ببینێ، لە شاری ئامەد بە سواری گەڕاوە تا بورجەکانی ببینێ[٢]، هەروەها مانەوەشی لە شار و قەڵا کوردییەکان گرینگیەکی دیکەی ئەو سەرچاوەیە، چونکە دوو مانگ لە حەسنکێف و مانگێك لە کیفەندوور، پازدە رۆژ لە بەدلیس ماوەتەوە[٣] سەرباری ئەوەی بە زۆرینەی شار و قەڵا کوردییەکانی باکوری کوردستان تێپەڕبووە یاخۆ ماوەتەوە.

---

1 -- Ibid, p.141.

2 -- Ibid, p.145.

3- - Ibid, p.147,152.

(گری) وەرگێڕی ئینگلیزیی سەفەرنامەکە لە پەراوێزدا بەم شێوەیە ناساندوویەتی: شوێنەکەی وێرانەیەکە لە دۆڵێکی تەنگی نێزیك بەدلیسدا.

## ٢- سەرچاوەی زارەکی و بیستن:

بازرگانی ڤینیسیایی هەندێ ڕووداوی تۆمار کردووە، هەرچەندە لە ماوەی سەفەرەکەی دا ڕوویداوە. کەچی بە چاوی خۆی نەی دیوە، بگرە لە ڕێگەی کەسانی دیکە بیستویەتی تۆماری کردووە، تەواوی هێرشی سەفەوی بۆ سەر قەڵای وان، لە ڕێگەی زاری ئەو سەربازانەی کە گەڕابوونەوە بیستووە، دواتر نووسیویەتەوە[١] هەروەها لە حەلەبدا بازرگانی ڤینیسیایی چەندین جار لەگەڵ دوو کچەکەی ئوزون حەسەن، کە لە ژنە مەسیحییەکەی بوون، قسەی کردووە[٢]، پێدەچێ ئەو چاپتەرانەی لەسەر ئوزون حەسەن و یەعقوبی کوڕیەتی، لەوان بیستبێ.

## ٣- زانیاریی خۆی:

بازرگانی ڤینیسیایی پشتی بە زانیاریی خۆی بەستووە، لەبەرئەوەی بە وردی ئاگەداری ئەوە بووە، کە ئوزون حەسەن بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی شکاوە، چونکە تۆپەکانی حکوومەتی ڤینیسیایی نەگەیشتوویەتی، هەروەها لەشکری زیاتریی ئاق قۆیونلو لە ئێران پێی رانەگەیشتووە[٣].

سەرەڕای ئەوەی لە ناساندنی شار و قەڵاکان بازرگانی ڤینیسیایی زانیاریی هەبووە. بۆ نموونە لە کۆندا شاری بەدلیس ئەسکەندەر چێ کردووە[٤] یان شاری خەڵات، کە لە شوێنەوار و تەلارەکانی دەرکەوتووە لە کۆندا شارێکی مەزن بووە[٥].

---

1 -- Ibid, p.181.

2 -- Ibid, p.183.

3 -- Ibid, p p. 181- 182

4- - Ibid, p.157.

شرفخان البدليسي: شرفنامه، ترجمه: محمد جميل الملا احمد الروزبياني، اربيل، مؤسسه موكرياني، ٢٠٠١.ص٥٦٩.

5 -- Ibid, P.160.

لە راستیدا بابەتی روانین بۆ خۆی بابـەتێکی فەلسـەفییە، لێـرەدا روانـین پابەنـدە بـە زەمەن شوێنێکی دیارکراو کەسێکی دیاریکراو، ئەو کەسەش بازرگانی ڤینیسیاییە، کـە سەفەرنامەکەی خۆی نووسیوەتەوە، لەبەرئەوە پتر پابەند دەبین بەو کۆنتێکستەی گەشتیار تیایدا بیروڕای خۆی دەهەمبەر کورد دەربڕیوە، بۆیە تەواوی باسکردنی کورد لـە روانینـی بازرگانی ڤینیسیاییدا، کات و شوێنی دیاریکراو لەنێو دەقی سەفەرنامەکەی پێکدێنێ.

ئەو زانیارییانەی لە روانینـی بازرگـانی ڤینیسـیاییدا هـەن، زانیـاری گـرینگن بـۆ نەتەوەی کورد و پێوەندیی لەگەڵ دراوسـێکانیدا لەبەرئـەوەی لـە زۆرینـەی شـارەکانی کوردستان بە تایبەتی کوردسـتانی بـاکور ماوەتـەوە، لـە هـەمان کـاتیش سـەری لـە تەوریزی پایتەختی ئێران ـ لەو سەردەمدا — داوەو ئاگـەداری بزاوتـی شـا ئیسـماعیل بووە و هەروەها لە بیروڕای سەفەویش زانیوە، لەبەرئەوە سەرنجی گرینگی دەرخسـتوون، لەو بارەوە دەتوانین بڵێین ئەو خاڵانەی دەستنیشانی کردوون، سەرەتای دابڕانی کورد بـە قەوارەی ئێران یاخود لەبەربیروباوەری مەزهەبی — شیعە — خستۆتەروو.

بازرگانی نەناسراو لە چاپتەری یەکەمدا باسی لـەوە کـردووە، کـە زانیـاریی زۆری لەبارەی شاری گەورە و میللـەت و نەتـەوە و خـەڵکان و دابونـەریتی بێگانـە هەیـە[1]، گومان لەوە دانییە بازرگانی ڤینیسیایی چووەتە هەر شار و شـارۆکە و قەڵایـەك، هـەر تەنیا لە پیشەکەی خۆی زانیاری نەنووسیووە، بگرە سەرنجی دیکەشی لە بواری سیاسـی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هی دیکە خستۆتە ڕوو.

دەبێ ئەوەش بڵێین بازرگانی ڤینیسیایی لەبارەی روانینی خۆی بە سـادەیی سـەرنجی خسـتۆتە ڕوو، خـۆی گوتوویـەتی، کـە جگـە لـەوەی بـە کردەنـی بینیویـەتی یـاخۆ بیستوویەتی لەمە پتری نەنووسیووە، بۆیە لە هیچ شـتێك زێـدەڕۆیی نـەکردووە، بگـرە مەبەست و ئامانجـەکانی خـۆی بـە سـادەیی دەرخسـتووە، وەك بازرگـانێکی راسـتگۆ سەفەرنامەکەی نووسیوەتەوە بە دەستەواژە و وشەی ڕەنگاوڕەنگ نەیڕازاندۆتەوە[2].

---

1 -- Ibid, P.14 ..سفرنامە،ص٣٧٧

2 -- Ibid, P.14..سفرنامە،ص٣٧٧

## ا. وابەستەبوونی ئاینی کورد:

تا ئەو کات و سەردەمە ی بازرگانی ڤینیسیایی هاتۆتە کوردستان — سەرەتای سەدەی (١٦ ز / ١١ ك)یە، کورد لە رووی وابەستەبوونەوە لەنێو ئاینی ئیسلامدا سوونە بووە، پەرەسەندنی بیروباوەڕی سوونە لەنێو کورد لەو سەردەمەدا بابەتێکی فرەوان و تۆژینەوەی زۆری دەوێ، بە درێژایی سەدەکاتن لەنێو ئیسلامدا نەك هەر لە کوردستان، بگرە لە دەرەوەی کوردستانیش چەندین زانای ئاینی کورد هەڵکەوتوون و کاریگەرییان بەسەر دەوروبەر و کۆمەڵگەی خۆیانەوە هەبووە[1] پاش رووخانی دەوڵەتی ئاق قۆیۆنلو[2] لە ئێران بەدەستی شا ئیسماعیل لەسەرەتای سەدەی (١٦ ز/ ١١ك) شا ئیسماعیل ناوکی سوپاکەی لە پیاوانی تەریقەتەکەی پێکهاتبوو، لە رێگەی تەریقەتی سەفەوییەوە گەشەی بە دەوڵەتێکی زلهێزدا و مەزهەبی شیعەی کردە ئاینی رەسمی دەوڵەت [3] بازرگانی ڤینیسیایی باسی لە خاڵە گشتییەکانی عەقیدەی شێخ ئیسماعیل کردووە، بەتایبەتی بڵاوبوونەوەی لە تەورێزی پایتەختدا [4]، لەوێدا لەوە دواوە نێزیکەی سەد و پەنجا کەس لەژێر درەختێکی گەورە کۆبوونەتەوە، لەبارەی ئاینی نوێ، واتە ئاینی سەفەوی وەعز و وتاریان دراوەتێ، لەوێدا پرسیاریش کراوە،

---

١ - بڕوانە: البدليسي:ص٥٧٦-٥٨٥. محەمەد بایراقدار: ئیدریس بەدلیسی، وەرگێڕ،شکور مستەفا، چاپی یەکەم، کوردستان،١٩٩٩ ز، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، کتێبی سەنتەری برایەتی٤، ل١٤-٣٨.د. قادر محمد حسن: اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية(دراسة عن دور الكرد الحضاري في مصر و بلاد الشام خلال عهد المماليك ، سبيريز، ط١ن مصبعة الحاج هاشم، اربيل ٢٠٠٩.

٢ - بڕوانە حسن روملو

٣ - والتر هينس:تشكيل دولت ملى در ايران، ت:كيكاووس جهاندارى چ چهارم ١٣٧٧هـ.ش، تهران،انتشارات خوارزمى، ص١٢٦.هانس روبرت رويمر:ايران در راه عصر جديد(تاريخ ايران از ١٣٥٠-١٧٥٠) ت:اژر اهنچى، انتشارات تهران، پاييز ١٣٨٠هـ.ش،چ١، ص٢٨٣-٢٨٦.

٤ - شایانی باسە پێش سەفەوی تەورێز لە رووی مەزهەبییەوە زۆرینەی سوننە، چەندان زانا گەورەی لێ هەبوون، لەوانە سەرباری ئەوەی پایتەختی دەوڵەتی ئاق قۆیۆنلو سوننە مەزهەب بووە. بڕوانە والتر هینس: ص١٤٥-١٥٣.

واعیزەکانیش دووکەس بوون، کە لە پرسەکانی ئاین ـ ڕێبازـ ی نوێ قالبوونەتەوە، زۆر لە خەڵکی ئەوێ دەیانگوت، یەکێ لەوانە ڕێنوێنی ئاینی بە سوڵتان شێخ ئیسماعیل داوە، ئەوی دیکەش بە وردی چاوەدێری کەسی یەکەم دەکات و خەڵکیشی بۆ گردبوونەوە و کۆبوونەوە هان دەدا[1].

لێرەوە دەردەکەوێ سەرباری ئەوەی سەفەوی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست و ئاینی ڕەسمیی ڕاگەیاندووە، لەنێو خەڵکیشدا بانگەواز بڵاودەکەنەوە، بەجۆرێ لە دوو لاوە هەنگاویان ناوە، لەلایەکەوە بەهۆی دەسەڵاتەوە، لەلایەکی دیکە لەنێو خەڵکیدا. هەروەها روونی کردۆتەوە خەڵکی ئێران شا ئیسماعیلیان زۆر خۆش ویستووە، بەرادەی ئەوەی پەرستوویانە، بەتایبەتی قزلباشەکان ـ ئەندامانی سوپاکەی ـ. کە بێ هیچ بەرامبەرێك دەچنە جەنگ و لە ڕێ و لە پێناو "شا" خۆیان بەخت دەکەن، لە جەنگ هاواردەکەن و دەڵێن "شێخ ، شێخ" شا ئیسماعیل بە دوو واتە پەنای بۆ دەبەن، جارێکیان وەکو فریادڕەس بەهانایانەوە هاتبێت، جارێکی دیکەیان بە واتای پێغەمبەر و بگرە زیاتریش ناوی دەهێنن، موسڵمانان دەڵێن " لا الە الا الله محمد رسول الله" کەچی — پێڕەوانی سەفەوی — دەیانوت "لا الە الا الله اسماعیل ولی الله" بازرگان گوتویەتی: بیستوومە کە ئیسماعیل لەم ڕووەوە ئەمەی پێ خۆش نییە[2].

ئەمەش دەری دەخات خەڵکی ئێران زۆر بە توندی پابەندی سەفەوی ـ شیعەگەری ـ و خودی شا ئیسماعیل بوون، بێگومان ئەم پابەندبوونە لەسەردەمی پێشوو، لەسەردەمی دەسەڵاتی تەیمووری [3] و قەرە قۆیۆنلو [1] و ئاق قۆیۆنلو بەو جۆرە لە ئێران

---

١ - سفرنامە:٤٠٩

٢ - سفرنامەص٤٥٦_٤٥٧.

٣ - تەیمووری لەنگ: پاش مردنی تەیمووری لەنگ نەوەکانی لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئێران و ئەفغانستانی ئێستە دەسەڵاتیان گرتە دەست، شاهروخی کوڕی تەیمووری لەنگ هەراتی کردە پایتەختی خۆی، لەسەردەمی وی دا دەسەڵاتیان گەیشتە چڵەپۆیە، دواجار ئوزون حەسەن لە ساڵی ٨٧٣ھ/١٤٦٨ز کۆتایی پێ هێنان. بڕوانە: حسین میر جعفری: تاریخ تیموریان و ترکمانان، انتشارات دانشگاه اصفهان.

رووی نەداوە، لەلایەکەوە سنوورێکی زۆری ئێران پێکەوە گرێ بدا، لەلایەکی دیکەوە پێوەندیی خەڵك و دەسەڵات پتەوتر بکات.

هەروەها لەوەش دواوە، کە ئەو ڕێبازە ئاینییە کاری لە جلوبەرگیش کردووە، گوتویەتی: ئەوان کڵاوی سوور لەسەر دەکەن، کە بڵندە و هێمای دوازدە ئیمامی [2] بە سەرەوە دیارە و ریش و سمێڵیش ناتاشن[3].

بازرگانی ڤینیسیایی روونی کردۆتەوە ، کە زۆرینەی خەڵکی ئێران هاتوونەتە سەر ئاینزایی شیعە و بڕوایان بە دوازدە ئیمام هێناوە، بە کەسێکیشەوە پابەندن، کە پایەی لە رووی سیاسی و ئاینییەوە زۆر بەرزە ، ئەمەش وای لێکردوون بە توندی وەری بگرن ، تەنانەت لە جلوبەرگیشیان رەنگی داوەتەوە.

لەگەڵ ئەم بەرئەنجانەش لەبەرئەوەی ئەو رووی لە کوردستانیش کردووە، هەڵوێستی کوردی لەبارەی ئەم رێبازەوە لەو سەردەمەدا خستۆتە ڕوو، ئەم هەڵوێستەشی لە میانەی میر و سەرداره کوردەکان روون کردۆتەوە، دیارە لەو سەردەمەدا زۆرینەی قەوارە کوردییەکان لە کوردستانی باکور کۆبوونەتەوە، ئەم پێوەندییەشی، واتە پێوەندیی کورد بە ئاینی سەفەوی لە سێ شوێن دیاری کردووە و

---

١ - قەرە قۆیۆنلو: خێڵێکی تورکمانە، پاش رووخانی دەوڵەتی ئیلخانی، توانیی لە هەرێمی دیاربەکر جێگەی خۆی بکاتەوە و رۆڵی لە مێژووی ناوچەکە و دەوروبەری هەبێت، لە ماوە سەرداریێتی قەرە یوسف دا سەرباری ئەوەی شەڕی توندی لەگەڵ تەیمووڕ لەنگ کرد، توانیی لە ساڵی ٨٢٣ك/تەوریز بگرێ، دوای لەناوبردنی دەسەڵاتی جەلائیری توانیی بەغدا بخاتە ژێر رکێفی خۆی و دەوڵەتی ئاق قۆیۆنلو دابمەزرێنێ، دواتر کوڕەکانی دەسەڵاتیان گرتە دەست تا لە ساڵی ٨٧١ك/١٤٦٦ز ئوزون حەسەن جیهانشای کوڕ قەرە یوسفی کوشت و کۆتایی بە دەوڵەتی قەرە قۆیۆنلو هێنا. بڕوانە حسین میر جعفری: ص٢٣٢-٢٦٣

٢ - دوازدە ئیمامی: مەزهەبێکی شیعەیە و باوەڕیان لەسەر بنەمای دوازدە ئیمام دامەزراوە، کە لە ئیمامی عەلییەوە دەست پێ دەکات تا دوازدە پشتی دیکەی، شێخ سەفیەدینی باپیری شا ئیسماعیل بانگەشەی دەکرد، کە بە بیست پشت دەگاتە موسا کازمی ئیمامی حەفتەم، سەفەوی لەگەڵ پەرەسەندن و چەسپاندنی دەسەڵاتیان کردیانە مەزهەبیی رەسمیی دەوڵەت. رویر:ص٢٥٨-٢٦٧.

٣ - سفرنامە:ص٤٥٧

بە ئاشکرا روونی کردۆتەوە، کە کوردان چ میر و چ خەڵکەکەی لە ناخەوە رقیان لە رێبازی سەفەوییە، ئەم رق لێ بوونەوەیەش، کە لە بنەچەیەکی بیروباوەڕەوە سەرچاوەی گرتووە، لە تەواوی کۆمەڵگەی کوردەواری بڵاوبۆتەوە و چەسپاوە، کورد تەنیا بە رواڵەت کڵاوی سوور لەسەر دەنێن، ئەگینا لە دڵەوە بەهیچ جۆرێ مەزهەبی شا ئیسماعیلیان قبووڵ نییە.

لە چاپتەری چوارەمدا باسی لە میری حەسنکێفی کردووە، گوتوویەتی، کە زاوای شا ئیسماعیلە و پێڕەوی لە شا ئیسماعیل ناکات، چونکە کوردە و کوردیش یاخی و سەرکێشن، هەرچەندە کڵاوی سوور لەسەر دەنێن، بەڵام لە ناخەوە هەواداری سەفەوی نییە، تەنیا بۆ ڕواڵەت ئەم کارە دەکەن[1] لە چاپتەری حەڤدەدا ئاماژەی داوە، کە سوڵتان خەلیل کوردە و خزمی شا ئیسماعیلە، هەرچەندە کوردان گوێڕایەڵی سەفەوییانن، بەڵام لە دڵەوە نەفرەتیان لێ دەکەن[2]، لە باسی شاری بەدلیس دا نووسیوویەتی، کە ئێرانییەکان (پێڕەوانی شا ئیسماعیل) چوونەتە ژێر ئاڵای رێبازی سەفەوی و کڵاوی سوور لەسەر دەکەن، تەواوی کوردان لە بەرانبەر ئێرانییەکان موسڵمانترن، چونکە ئێرانییەکان چوونەتە ژێر ئاڵای سەفەوی، کەچی کوردان ئەم ئاینەیان قبووڵ نییە، هەرچەندە کڵاوی سوور لەسەر دەنێن، بەڵام لە ناخەوە رقیان لەو ئاینەیە[3].

وەك دەردەکەوێ بازرگانی ڤینیسیایی لەو سێ شوێنەدا بە ئاشکرا باسی لە نارەزایی و ناتەبایی بیروباوەڕی کورد و سەفەوی کردووە، لە چەندین باری دیکە باسی لە نارەزایی کورد بەرامبەر ئوستا جلوخان والی دیاربەکری سەفەوی کردووە، لەبەرئەوە کوردستانی باکور ئەو سەردەم مەکۆ و مەڵبەندی قەوارە سیاسییەکانی کورد بووە، لەبەرئەوە سیاسەت و پێوەندیی کورد، لەوێ رەسم دەکرێ، دەتوانین

1- Ibid, P.152 .سفرنامه،ص٣٩٠_٣٩١.

2 - Ibid, P.95.سفرنامه،ص٤٤٣.

3 - Ibid, P.157.سفرنامه،ص٣٩٧.

لەبارەی بیروباوەڕی کورد بۆ مەزهەبی نوێ و روانینی بازرگانی بۆ سەفەوی لەو بارەوە ئەم خاڵانە بخەینە ڕوو:

١- لە رووی موسڵمانییەوە کورد لە ئێرانییەکان موسڵمانترن، بازرگانی ڤینیسیایی بەبێ ئەوەی باس لەوە بکات، لەبەرچی کورد موسڵمانترن؟ ئەم رایەی دەرخستووە، لە راستیدا روونکردنەوەی موسڵمانبوون لەم رووەوە کارێکی ئاسان نییە، بەڵام ئەو لەلایەکەوە خۆی لە بیروباوەڕی کوردانی کۆڵیوەتەوە، لەلایەکی دیکەوە بە چاوی خۆی سەرنجی لە ئۆل و بیروباوەڕی سەفەوی داوە.

٢- میرە کوردەکان لە سەرەتا روویان لە سەفەوی ناوە و رێزیان لە بیروباوەڕی شا ئیسماعیل گرتووە، نەبوونەتە شیعە، بۆیە ئەم هەنگاوە لەلایەن میرە کوردەکانەوە لایەنی سیاسەتکردنی بە خۆوە گرتووە، هەروەك چۆن شا ئیسماعیلیش بەرامبەر کورد سیاسەتی کردووە و خوشکی خۆی داوە بە سوڵتان خەلیل.

٣- وەنەبێ هەر تەنیا میرە کوردەکان دژی ئۆلگەری سەفەوی بوون بن، بگرە میر و بژاردەی ئاینی و خەڵکە هەموویان مکوڕ بوون لەسەر بیروباوەڕی ئاینی خۆیان.

٤- کورد ئەو بیروباوەڕەی هەیەتی نایگۆڕێ، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر هەڵوێستی لەگەڵ سەفەوی یەکلاکردۆتەوە.

٥- کورد بە ئاشکرا بیروباوەڕی سەفەوی رەت کردۆتەوە، جا هەن هەر لە سەرەتاوە دژی وەستاون و هەن دواتر.

٦- ئەم هەڵوێستانەی کورد و میرەکانیان رۆڵی گرینگیان هەبووە، لەو سەربەخۆییەوە ویستوویانە لە سنووری ئێران یان سنووری عوسمانی پارێزگاریی لێ بکەن، ئەمەش سەرەتای لەتبوونی کورد دەردەخات، کە دواتر ئەو ململانێیە هێندە قووڵ بۆتەوە پاشکۆیەتی میرە کوردەکانی روون کردۆتەوە، دواجار لە رێگەی هەنگاوەکانی "ئیدریس بەدلیس"[١]ـەوە کورد بڕیاری داوە بچێتە قەڵەمڕەوی گەورەی عوسمانی

---

١ - بڕوانە:محەممەد بایراقدار: س.پ،ل١٤-١٨.

## ب . کەسایەتیی کورد:

لە کۆی ماوەی سەفەرەکەی بازرگانی ڤینیسیایی، ماوەیەکی زۆر لەنێو کوردان گەڕاوە و ژیاوە، بۆیە لە سەفەرنامەکەشی بەب ەراورد لەگەڵ چاپتەرەکانی دیکە، بەشێکی زۆرتری بۆ کورد تەرخان کردووە، دەتوانین بڵێین لەبەرئەوەی زمانی زانیوە، توانیویەتی راستەوخۆ زانیارییەکان وەربگرێ، هەرچەندە باسی ئەوەی نەکردووە، کە زمانی کوردی زانیبێ، بەڵام ئاماژەی بەوە داوە، شارەزایی باشی لە هەر سێ زمانی (عەجەمی و تورکی و عەرەبی) هەبووە[1]، لێرەدا روونی نەکردۆتەوە، ئایا زمانی عەجەمی مەبەستی زمانی کوردییە یان زمانی فارسی، هەرچەندە بە بەراورد لەگەڵ ناوچە فارسینشینەکان، ئەو باسی ناوچە فارسینیشنەکانی نەکردووە.

لەبارەی ئازایەتی و خۆڕاگریی کوردەوە، لەشەڕەکانی دا باسی کردووە، کورد لە قەڵاکانیان بە سەختی بەرگرییان کردووە و جەنگاون، لە هێرشی ئوستا جلوخان بۆ سەر میرنشینی حەسنکێف هێرشبەران هەرچییان کردووە بۆ داگیرکردنی قەڵاکە هیچیان لە دەست نەهاتووە، ئوستا جلوخان دە هەزار سەربازی کۆکردۆتەوە، شەو و رۆژ جەنگاوە، کەچی سەرکەوتوون و ئەسپ و نێزە و تیر و کەوان و تفەنگەکانیان زەفەری بە کوردان نەبردووە[2].

بەهەمان شێوەش لە بەرامبەر هێرشی سەفەوی بۆ سەروان، بەرگرییان کردووە، هەرچەندە قزلباشەکان بە هەموو هێزیانەوە هێرشیان بردووە و کوردان ئەگەر قەڵاکەشیان لە دەست دابێ، خۆیان بە دەستەوە نەداوە و دەربازبوون [3]، سەفەویش لەبەر سەختی ناوچەکە، نەیتوانیوە دەستگیریان بکەن.

1 - Ibid, P.142.سفرنامه،ص٣٧٨.

2- Ibid, P.153.سفرنامه،ص٣٩١.

3 - Ibid, P.163.سفرنامه،ص٤٠٣.

ئازایەتی و خۆڕاگریی و خۆبەدەستەوەنەدان لە ئاکارەکانی کوردن، هەتا ئـەبو بەکر تارانیی مێژوونووسی دەربارەی ئاق قۆیۆنلو، چەند دەیەیەك بەر لە بازرگانی ڤینیسیایی باسی لەو ئاکارانە کـردووە، کـە ئەسـکەندەری کـوڕی قـەرە یوسـف ویستوویەتی قەڵای بەدلیس داگیر بکات[1].

لـەبارەی چـاکی و راسـتگۆییەوە بازرگـانی ڤینیسـیایی سـەرنجی گرینگـی خستۆتەڕوو، لەو سەردەم دا کەم گەڕیدە بـەم شـێوەیە باسـی ئـەو خەسـڵەتانەی کوردیان کردووە، لە باسکردنی خـەڵکی شـاری حەسـنکێف لـەوە دواوە، کـورد مرۆڤـی زۆر چـاك و راسـتگۆن، هـەروەها لـەبارەی ئافرەتـانی حەسـنکێفەوە گوتویەتی: ژنانی ئەم شارە لە هەموو شارەکانی دیکەی دیاربـەکر جـوانترن، لـە باسی شاری ئورفەش خەڵکەکەی بەباشی و راستگۆ وەسف کردووە[2].

لە شاری تەورێزیش وەسفی پیاوانی ئەوێی کردووە، کە پیاوانی ئەم ناوچەیە لە پیاوانی ئێمە (ڤینیسیایی) بالآیان بەرزترە[3]، گومان لـەوەدا نییـە گەڕیـدەکاتنی دیکەش کە هاتوونەتە کوردستان لەبارەی کەسایەتیی کورد سـەرنجی گرینگییـان خستۆتەڕوو، دەکاترین بێژین بازرگانی ڤینیسیایی لە بەرایی ئەو گەڕیدانەیە، کە بۆ خۆی ماوەیەکی باش لەگەڵ کوردان هەڵسوکەوتی کردووە و ناسیونی.

ئەمەش دەرگەی بۆ گەڕیدەکاتنی دیکەش کردۆتەوە، کە لەسـەر کەسـایەتیی کورد بنووسن، دیاریە ئەم سەرنجانە گەڕیدەی دیکەش خستۆیانەتە روو[4].

## ج- رێگری:

بابـەتی رێگـری لـە کوردسـتان و وڵاتـانی دەوروبەریـدا بەدرێـژایی سـەدە و سەردەکاتن، بە تایبەتی لە سەردەمی خیلافەتی عەباسی تا سەردەمی عوسمانی،

---

١ - دیاربکرییە:س.پ،ل١٢٠-١٢٢.

2 - Ibid, P.145,154. سفرنامە،ص٣٨٢،ص٣٩٣. .

3 - Ibid, P172. سفرنامە،ص٤١٢.

٤- د. شـاکر خصـباك:الاکراد فی نقـر العلمـاو و الرحالـە الغربیین.مجلـە شمـس کردسـتانزالعدد(٢) حزیـران ١٩٧٠،ص

بابــەتێکی گــرینگ بــووە، وەنــەبێ ڕێگــری هــەر تــەنیا گەڕیــدە و وڵاتناســە موسڵمانەکان باسیان لەبارەوە کردبێ، بگرە گەڕیدە ئەوروپاییەکانیش لێی دواون.

ڕێگری دیاردەیەکە بۆ خۆی پتر لە بارودۆخی ناجێگیر و شلەژاو ســەرهەڵدەدا، لە کاتێکدا ئەگــەر دەســەڵاتی ناوەنــدیی ڕوو لــە هەڵــدێر بکــات، پــاش ئــەوەی دەسەڵاتی ناوەندیی شا عەباسی سـەفەوی پووکایــەوە ، میرنشــینە کوردییــەکان سەریان هەڵدا و پتر گەشەیان کرد. بە گوێرەی ئەو پێوەندییانــەی لەگــەڵ ناوەنــد هەیانبوو، توانیان پەرە بە ڕەوشی سیاسی خۆیان بــدەن، دەســەڵاتی ناوەنــد لــەو بارودۆخە نەیتوانیوە، خۆی بسەپێنێت، دواجار دیاردەی ڕێگــری لەبــەر نــەبوونی ناوەندێتیی بڵاوبۆوە[1]،

دیاردەی ڕێگری لە دەڤەرە کوردییەکان پێویستی بە لێکدانەوە و تۆژینــەوەی بارودۆخی تایبــەتی و بابــەتی و ناوچــەیی هــەن، بۆیــە لــەم ڕووەوە ناکرێــت بــە ڕوانینێکی گشتگیر سەیری دیاردەکە بکرێــت، لــەنێو کــوردیش وا دەســەڵاتێکی یەکپارچەی ناوەندی نەبووە، تا هەموو سنوورەکان کۆنترۆڵ بکات، بگرە کۆمەڵێ میرنشین هەبوون، لەنێو سنوورەکانیاندا دیاردەی ڕێگری هەبووە، سەرباری ئەوەی وەنەبێ ئەم دیاردەیە هەر تەنیا کورد ئەنجامی دابێ، بگرە نەتەوەی دیکەش، کــە دراوسێ کوردن ئەنجامیان داوە[2]، بابەتی ڕێگری گەلێ لە مێژوونووس و گەڕیدە و دیپلۆماتکار لێی دواون و هەریەکەیان بە جۆرێك بیروباوەڕی خۆی دەربڕیوە، هەن کە کوردستانیشی نەدیوە، کەچی باسی کردووە.[3]

ئەگەر لە ڕوانینی بازرگانی ڤینیسیایی لــەو بابەتــە بــدوێین، بــە پێچــەوانەی زۆرینەی گەڕیدەکاتنی دیکە، بەتایبەتی گەڕیدە و باڵیۆزانی ئیتاڵیی، بازرگــانی

---

١- حيدر لشكري:الكرد في العرفة الاسلامية،دهوك،ص١١٧- ١٢٤.

٢ - رحلة الايطالي كاسبارو باليي الي حلب –دير الزور- عنة – الفلوجة- بغداد سنة ١٥٧٩: عربها عن الايطالية و علق عليها الاب د.بطرس حداد ٢٠٠٨، دار العربية للموسوعات، ص٣٢.

٣- بڕوانە: حيدر لشكری: ص١١٧-١٢٠.

ڤینیسیایی زۆر بە ئەرێنی لە کوردانی روانیوە، بۆ خۆی زۆرینەی شارە گرینگەکانی کوردستانی باکور گەڕاوە و چەندین مانگ ماوەتەوە و خەریکی بازرگانی و سەوداکاری بووە و لە نێوان شا رو قەلاکان دا رێگەی سەختی بڕیوە، کەچی تووشی رێگەگرتن و دز و جەردە نەبووە، لە زۆرینەی شار و قەلاکان چۆتە کاروانسەرا – خان – و زانیویانە ئەو کەسە بازرگانە و خودان دراو و پوول و سامانە، کەچی تووشی رێگریی نەبووە، بۆ خۆی باسی چەندین کاروانسەرایی کردووە، ئەوەتا لە باسی حەسنکێف گوتوویەتی: " ئەم ولاتە هیچ رێگری تێدا نییە و پاکە، لە تەواوی ئەو ماوەیەی لە کاروانسەرا بووم، کەسێك کێشە و ئاریشەی بۆ چێ نەکردووم"[1] ئەم روانینەش پێچەوانەی هاونیشتمانییەکانی دیکەیەتی. بەر لەو پێنج هاونیشتمانییەی بە کوردستاندا تێپەڕبوون، هەرچەندە کاری ئەوان وایکردووە لە کوردستان شوێنی تێپەڕینیان بووە یان پێی دا هاتوون، لەم بارەدا کاری رێگری لە کوردستان بە پلەی یەکەم بە چۆنییەتی کاری گەڕیدەکانەوە پابەندە، هەروەها بارودۆخی سیاسی کوردستان و پێوەندیی لەگەڵ ناوەند و دراوسێکانی لەو بارەوە رۆڵیان هەبووە.

بازرگانی ڤینیسیایی ئاماژەی داوە لە حەسنکێف خەریکی سەودایی بووە و پارەی لابووە، کەچی هیچ کێشە و گرفتێکی نەهاتووەتە رێ، لە کاتێکدا باسی ئەوەی کردووە کە خەڵکەکەی و دەوروبەری کوردن[2].

لە نووسینەکانیدا ئەو سەرنجەمان لەلادا گەڵاڵە دەبێ، کە تا رادەیەکی زۆر ئەو وێناکردنانەی هەبووە، کورد رێگرن، چونکە ئەو بەو جۆرە ئاماژەی بۆ کردووە، ئەم ولاتە لە رێگر و دز و جەردە پاکە، دیارە زانیویەتی، کە رێگر هەیە لەو ولاتەدا جێگەی سەرنجیشە لەنێو سەفەرنامەکەی دا باسی هاونیشتمانییەکانی خۆی کردووە، لەبەرئەوە پێدەچێ یان ئەوانی دی بێ یان بۆیان باس کردبێ، یان

1- Ibid, P.157.سفرنامە،ص٣٩٧.

2- Ibid, P.157.سفرنامە،ص٣٩٧.

سەفەرنامەکانی خوێندبنەوە، چونکە هاونیشتمانیانی کوردیان بــە ڕێگــر وەســف کردووە[1].

وەکو روونە ئەو لە نێوان شار و قەڵا کوردییەکان گەڕاوە و لە وەرزی زستانیش ماوەتەوە، لەم رووەوە کاتێك لە بەدلیسەوە رووی لە حەسنکێف کردووە، روونــی کردۆتەوە، ئەم وڵاتە نێوان بەدلیس و حەسنکێف- وڵاتێکی تژی لە چیا و دۆڵ و گردە و تەنگەبەرە و شوێنی ترسناکیشی تێدایە[2]، جا ئەگەر ئەو ڕێگە ســەختەی پڕی بێ و تووشی ڕێگری نەبوو بێ، بێگومان ئەمەش بەڵگەیــەکی گرینگــە دژی ئەوانەی پێیان وایە ئەم خەسڵەتە لەنێو کورداندا زگماکە، بازرگــانی ڤینیســیایی بەهیچ جۆرێ رووبەڕووی ئەم دیاردە نەبۆتەوە، بگرە خەڵکەکەی بــە خــەڵکانێکی چاك وەسف کردووە.

1- Ibid, P180-181.سفرنامه،ص٤٢٢-٤٢٣.

2-Ibid, P.155.سفرنامه،ص٣٩٤.

بازرگانی ڤینیسیایی ئەگەر وەکو باڵیۆزێك بهاتبووایە دەربـاری شـا ئیسـماعیلی سەفەوی، رەنگە زیاتر شۆڕببووایەتەوە نێو بەرنامەیەکی سیاسی، هەروەك هاوڕێکانی بەر لە خۆی بە ئاشکرا هاوکاری ئاق قۆیۆنلویان کـردووە، کـە دژ بـە عوسمانییـەکان جەنگ رابگەیەنێ، کەچی تـەواوی شـوێنی سـەرفەنامەکەی بازرگـانی ڤینیسـیایی، دەتوانین بڵێین زۆرینەی هەرە زۆری ئەو شوێنانەی لێـی ماوەتـەوە شـوێنی ململانێـی نێوان سەفەوی و عوسمانییـەکان بـووە، بگـرە دواجـار لـەو ململانێیـەدا تـەورێزیش دەکەوێتە دەست سـوڵتانی عوسمـانی، لەبەرئـەوە هامشـۆی بازرگـانی لـە تـەورێز و کوردستانی سنووری عوسمانی وایکردووە سەرنجی گرینگی وا بخاتە ڕوو، تـا ڕادەیـەك دەتوانین بڵێین هەستی بەو کەلێنە کرد بوو، کە خەریکە لە نێوان دەوڵەتی سـەفەوی و کوردان دا پەیدا دەبـێ، ئـەم سەرنجانەشـی بـە بەڵگـەوە خسـتۆتە ڕوو، رەنگـە ئـەم سەرنجانەی بەهۆی باڵیۆزی ڤینیسیاییەوە دەست کەوتوون، سەرەڕای ئەوەی بازرگانی ڤینیسیایی لەنێو کوردان زۆر ژیاوە، هەروەها لەگەڵ سوپای شا ئیسماعیلیش بـووە، کە هێرشی بۆ عەلائودەولەی قارەمـانی بـردووە، کەواتـە بازرگـانی ڤینیسـیایی لـە شوێنێك زۆر ماوەتەوە بۆ شا ئیسماعیل زۆر سەخت بووە وەکـو ناوچـەکانی دیکـەی ئێران دەسەڵاتی بەسەردا بسەپێنێ، هەروەها زانیـاریی تـەواوی لـەبارەی گەڕیـدە و باڵیۆزانی پێش خۆی هەبووە[1]. باسـی کـردووە، چـۆن جـووڵاون لەبەرئەمـە بایـەخی سیاسی سەفەرنامەکە بۆ ئەم دوو خاڵە دابەش دەکەین:-

---

1- Ibid, P180-182 ..سفرنامە،ص۴۲۲-۴۲٤

## أ. پێوەندیی کورد و سەفەوییەکان:

لە سەروبەندی رووخانی دەوڵەتی ئاق قۆیۆنلودا بازرگانی ڤینیسیایی لە چاپتەری هەشتەم دا زۆر بە وردی باسی لە کۆشکی دەسەڵاتدارێتی ئـوزون حەسـەنی کـردووە، کە ئوزون حەسەن لە دەرەوەی تەورێز دروستی کـردووە، کۆشـکی هەشـت بەهەشـت هێندە بە مـەزنی و شـکۆدارییەوە چـێ کـراوە، بازرگـانی ڤینیسـیایی لـەو بـارەوە گوتوویەتی کە پاشایانی بەر لە ئۆزون حەسەن چەندان کۆشـکی جـوان و شـکۆداریان لەم شارە چێ کردووە، کەچی هیچ یەکێك لەوانە، ناگەنە کۆشـکی ئـۆزون حەسـەن[1]، ئەمەش رەنگدانەوەی دەسەڵاتدارێتی ئۆزون حەسەنە لە ناوچەکەدا، لە کاتێکدا ئۆزون حەسەن بەرانبەر کوردستان بە تایبەتی و ناوچەکانی دیکـە بەشـێوەیەکی ناوەنـدی و بگرە رەها حوکمی کردووە[2]. لەم چاپتەرەوە باسی لـە دەسـەڵاتدارێتی ئـاق قۆیۆنلـو کردووە تاکو رووخانی، هەروەها لای کردۆتەوە بە پێوەندیی ئۆزون حەسـەن و پاشـان ترانرۆن و دواتر جەنگی ئۆزون حەسەن لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیی باسی کردووە، دانـی بەوە ناوە کە تۆپخانەکانی دەوڵەتی ئەوان نەگەیشتوون و ئۆزون حەسەنیان بێ ئومێـد کردووە[3]، لە راستیدا ئەو ئامادەییەی ئۆزون حەسەن پیشانی دا لـەبارەی هاوکـاری و پێوەندیی دەوڵەتی ڤینیسیا و ئاق قۆیۆنلو، بە هەمان شێوە لە نێوان شا ئیسماعیل و دەوڵەتی ڤینیسیا دووبارە دەبێتەوە لـە کاتێکـدا زەمینـە لـەباربوو، لـە ناوچـەکانی میرنشینە کوردییەکان پاشـکۆیەتی و سـەربەخۆییان یەکلابێتـەوە، لـە کاتێکـدا لـە ماوەی ئاق قۆیۆنلو لەگەڵ ئەوانی ئۆزون حەسەن بەرامبەر سـوڵتانی عوسمـانی دۆڕا ، کەچـی ناوچـە کوردییـەکان (میرنشـینە کوردییـەکان)ی نەکەوتـە ژێـر ڕکێـف لـەو قۆناخەدا، هەڕەشەی ئاق قۆیۆنلـو بـۆ سـەر عوسمانییـەکان دەوسـتێندرا، ئەمـە تـا رووخانی ئاق بەردەوام بوو، ئەمە جگـە لـەوەی سـوڵتانی عوسمـانی وەك سـەردەمی

---

1- Ibid, P.173.سفرنامه،ص٤١٤.

٢- دیاربکریە.ل٥٣١-٥٣٢.

3- Ibid, P.180_181.سفرنامه،ص٤٢٢-٤٢٣.

سەفەوییەکان پاش سەرکەوتنی نەچووە قوولایی ئێران، کەچی لە سەردەمی سەفەوی بەهۆی کوردەوە، سولتانی عوسمانی نەك هەر تەنها هەڕەشەکانی سەفەوی راگرت، بگرە لە رۆژهەلاتی ئیمپراتۆرییەتەکەیدا سنوورێکی زۆری ئێران ـ کوردستان ـ ی خستە سەر. دەسەلاتدارانی مەغۆل لە سەردەمی هۆلاکۆەوە تاکو دوا سولتانی ئاق قۆیۆنلو بەم جۆرە سنووریان لە دەست نەدا، هەروەك شا ئیسماعیلی سەفەوی لە دەستی دا.

بازرگانی ڤینیسیایی چاپتەری یازدەی تەرخان کردووە بە دەسەلاتدارێتی یەعقوب، کە چۆن ئافرەتێك ژەهری پێ دا[1]، دواتر لە نێوان نەوەکانی ئۆزون حەسەن لەسەر دەسەلات ململانێی توند هاتە ئاراوە[2]، ئەمە وایکرد رێگە بۆ شا ئیسماعیلی سەفەوی خۆش ببێ و بەهۆی لایەنگرانی لە "ئەردەبیل"[3]ەوە هەنگاو بنێ و ململانێی ئەوان بقۆزێتەوە و کۆتایی بە دەسەلاتی ئاق قۆیۆنلو بهێنێ، بازرگانی ڤینیسایی لە چاپتەرەکانی دوازدە تاکو حەڤدە باسی لە پەرەسەندنی سیاسی و رۆحی و سەفەوی کردووە، کە دواجار تەورێزی گرتووە[4] و توانیویەتی لە رووی ئایدیولۆژی و سیاسییەوە ولاتێکی بەرفرەوان دابمەزرێنێ. تارەدەیەکی زۆریش بۆ ماوەیەکی زۆر ئارامی سیاسی لە ئێران بێتە کایەوە. بازرگانی ڤینیسایی هەرچەندە باسەکەی بە کورتیشتە ، بەلام بە شێوەیەکی جوان باسی لە رووداوە گرینگەکانی ململانێی ئاق قۆیۆنلو و سەفەوی کردووە ، لەگەلّ ئەوەی لە رووی مێژووییەوە لە ئوزون حەسەنەوە دەستی پێکردووە، بەلام بە هیچ جۆرێك باس لە پێوەندیی میرنشینە کوردییەکان و ئاق قۆیۆنلو نەکردووە، بگرە لەو سەردەمەی خۆی لە میرنشینە کوردییەکان ماوەتەوە سەرنجی گرینگی خستۆتە ڕوو، لەبەرئەوە پێدەچێ زانیارییە مێژووییەکانی لەبارەی

---

1- Ibid, P.183-184.سفرنامە،ص٤٢٦-٤٢٧.

2- Ibid, P.184.سفرنامە،ص٤٢٧.

٣- ئەردەبیل: شارێکە کەوتۆتە کەنارەکانی باشووری رۆژئاوای دەریای خەزەر (قەزوین) ز والتر هینتس:ص١.

4- Ibid, P.184-185.سفرنامە،ص٤٢٧-٤٢٨.

ئۆزون حەسەن و کوڕ و نەوەکانی پتر لە دەروازەی میرانی ترا بزۆنەوە بوو بێ، چونکە تا رادەیەکی باش باس لە ژنە مەسیحییەکەی ئۆزون حەسەن و کوڕەکەی لەو ژنە مەسیحییەکە کردووە[1].

لە راستیدا لەو سەردەمەی بنەماڵەی سەفەوی لە ئەردەبیل لە رووی رۆحی و سیاسییەوە پەرەیان سەندووە، ناوچەکەیان لە کوردستان دووربووە، لەبەرئەوە تا ئێستە لە سەرچاوەکان باس لە پێوەندیی کورد و سەفەوی نەکراوە، بەتایبەتی بەر لە هاتنە سەر تەخت لەلایەن شا ئیسماعیلەوە جێگەی ئاماژە پێدانە کورد لە سەردەمی ئاق قۆیۆنلودا لە رووی سیاسییەوە داپڵۆسان دەبوونە، لە لایەك میرنشینەکان رووبەڕووی هێرش و کاولکاری بوونەوە[2]، هەروەها هەژموونی گەشەسەندنی سەفەوی لە کوردستان دوور بووە، بۆیە پێشبینیی پێوەندیی ناکرێ، بازرگانی ڤینیسیایی، بەهیچ جۆرێك کە باس لە موریدەکاتنی شێخ سەفی کردووە، باسی لە کورد نەکردووە، لەبەرئەمە پێوەندیی کورد بە سەفەوی پاش گرتنی تەورێزی پایتەخت هاتۆتە کایەوە، پێوەندییەکەش زۆر چووەتە پێشەوە، بگرە کوردستان خاڵێکی گرینگ بووە لە دەوڵەتە نوێیەکەی سەفەوی دا. بە گوێرەی ئەو سەرەنجانەی بازرگانی ڤینیسایی لەبارەی پێوەندیی کورد و سەفەوی دەریخستوون دوو پێوەندیی گرینگمان دەست دەکەوێ:

### یەکەم: پاشکۆیەتی رووکەش:

بە دوو شێوازی جودا هەردوو دەوڵەتی قەرە قۆیۆنلو و ئاق قۆیۆنلو لەگەڵ میرنشینە کوردییەکان سەوداییان کردووە، بە گشتیی دەوڵەتی قەرە قۆیۆنلو دانی بە سەربەخۆیی میرنشینە کوردییەکان ناوە، لە بەرامبەردا میرنشینە کوردییەکان لە رووی سەربازییەوە کۆمەکی قەرە قۆیۆنلویان کردووە، کەچی بە پێچەوانەوەوە ئاق

1 - Ibid, P.178سفرنامە،ص٤٢٠.

٢ - کتاب دیاربکریە م. س. ج٢. ص٥٤٢، ص٥٥١. کتێبی دیاربکرییە: ل٥٣١-٥٣٢ ،البدلیسی:ص٣٤٦،٣١٥.

قۆیۆنلو پاش گرتنی تەورێز لە ساڵی (٨٧٣ك/١٤٦٨ز) هەڵمەتێكی گەورە بۆ سەر میرنیشینە كوردییەكان ئەنجام دەدات و زۆرینەیان داگیركرد[١]، لەو دوو جۆرە سەوداییەدا هیچیان نەبووە هۆی ئەوەی میرنشینە كوردیەكان لەناو بچن، بەپێی ئەم سەرەنجانە شا ئیسماعیلی سەفەوی پاش ئەوەی دەوڵەتی ئاق قۆیۆنلوی رووخاند[٢]، لە سەرەتادا بە شێوەیەكی نەرم و بە تەگبیر رووی لە ناوچەكە كردووە، لەبەرئەوە تێبینیی دەكرێ لە سەرەتادا شا ئیسماعیل لەگەڵ میرنشینە كوردییەكان نەجەنگاوە.

بازرگانی ڤینیسیایی لە چاپتەری یەكەمدا باسی لەوە كردووە لە ساڵی (١٥٠٧ ز / ٩١٢ – ٩١٣ ك) لە كاتی هەڵمەتی شا ئیسماعیل بۆ سەر ئازەربیجان عەلائو دەولەی قارەمانی ئەو لەگەڵ لەشكری شا ئیسماعیل بووە لە ئەرزنجان و چل رۆژ لەوێندەر ماوەتەوە، ئەو ئاگەداری زۆرینەی شەڕەكانی شا ئیسماعیل بووە چ خۆی لەوێ بووە یاخۆ بیستوویەتی، لەوانە لەگەڵ شیروان و هەتا لەشكر كۆكردنەوەشی لە تەورێز[٣] لە باسی شاری جزیرەدا بازرگانی ڤینیسیایی گوتویەتی: حاكمی شاری جزیرە كوردە و لەژێر فەرمانڕەوایی ئوستا جلومحەمەد بیگ حاكمی دیاربەكرە، بەلام ئەو سەرنجەشی خستۆتە ڕوو، كە هەرچەندە خەریكی دروستكردنی قەلایەكی چاكن، بەلام لەگەڵ ئەوەش لەژێر دەسەلاتی ئوستا جلو محەمەدن[٤]، هەرچەندە بازرگانی ڤینیسیایی ناوی میری جزیرەی نەهێناوە، بەلام دەردەكەوێ میری جزیرە لەگەڵ ئەوەی لەو بارودۆخەدا پاشكۆیەتی بۆ سەفەوی راگەیاندووە، بەلام خەریكی خۆ رێكخستنەوەی خۆی بووە، ئەمەش لە سەرەتای هاتنە سەركاری سەفەوی بوو، چونكە تا ئەو كاتە شا ئیسماعیل بە تەواوی بەسەر نەیارەكانی سەرنەكەتووە، لە كوردستانیش گەلێ گرفت و ئاریشەی رووبەڕووبۆتەوە، چونكە ئوستا جلومحەمەدی زاواشی فەرمانڕەوای

---

١ - كتاب دیاربكریە: م. س. ج٢. ص٥٤٢، ص٥٥١.. البدلیسی ص٣٤٦،٣١٥. رابعە: ل٤٠٠.

٢ - بڕوانە: رویمر:ص ٢٦٧-٢٨٢.

3 - Ibid, P.142.سفرنامە،ص٣٧٨.

4- Ibid, P.150.سفرنامە،ص٣٨٩.

هەرێمی دیاربەکر، لە سەروبەندی رووخانی دەوڵەتی ئـاق قۆیۆنلـودا عەلائولدەولـەی قارەمانی هەلەکەی قۆستەوە و هەر سێ شاری ئامەد و ئورفە و خەرپووتی داگیرکـرد و خستییە سەر قەڵەمڕەوەکەی، شا ئیسماعیل بە ئوستاجلوی محەمەدی راسپارد، ئەو شارانە لە چنگ عەلائولدەولە بسـێنێ، سـەرەتا ئورفـەی لـەژێر چـنگی دەر کـرد و ژمارەیەکی یەکجار زۆریشی لە خەڵکی شارەکەی کوشت، لـە گرتنـەوەی ئامـەدیش سەرنەکەوت، دواجار رووی لە خەرپووت کرد، لەوێش شکسـتی هێنـا، لـە ئـەنجامی ئەمە لە ئورفە کشایەوە و رووی لە ماردین کرد بێ خوێنڕشتن، خەڵکی ئەوی پەنایان خواست، عەلائولدەولە کە بەرەو ئورفە چوو، هـەوڵی دا ئـەوێ بگـرێ و خـەڵکێکی زۆری لە گوندەکاتنی دەوروبەر، کە زۆرینەی هـەرە زۆریـان کـوردن بـوون، کوشـتوبڕ کرد[1]، ئەم ململانێیە لەنێو جەرگەی میرنشینە کوردییـەکان روویـداوە، بۆیـە مـیری جزیرە بـە تـەواوی ڤـان و نیـازی شـا ئیسـماعیلی بـۆ دەرنەکـەوتووە، لەلایەکـەوە پاشکۆیەتی راگەیاندووە، لەلایەکی دیکەوە خۆی رێکخستۆتەوە، گومان لەوەدا نییـە لەو کاتەدا، کە هێشتا ململانێیەکان بە تەواوەتی یەکلانـە بۆتـەوە، نـەدەکرا مـیری جزیرە، تا سەر بچێتە پاڵ یەکێکیان کە خۆی رێکخستووە و زانیوویەتی لە ئاینـدەدا ساتوسەودایی لەگەڵ سەفەوی هەستیار دەبێ و دەچێتە قۆناخێکی مەترسیدارەوە[2].

بازرگانی ڤینیسیایی جگە لەم سەرنجە سیاسییە هیچ سەرنجێکی دیکەی لـەبارەی جزیرەوە نەخستۆتەروو، لەو بارو دۆخە ناسکەدا شا ئیسماعیل بۆ ئـەوەی کوردسـتان بەتایبەتی نێزیك سنووری عوسمانی کۆنترۆڵ بکات، هـەر لەسـەرەتاوە سـێ خوسـکی خۆی دا بەو کەسانەی لە کوردسـتان کاربەدەسـتن، لـە هـەموو گـرینگتر ئوسـتاجلو محەمەدی زاوای بوو، ئوستاجلو فەرمانڕەوای هەرێمی دیاربـەکر پـێ سـپێردرا، زاوای دووەمی سوڵتان خەلیلی میری حەسنکێف بـوو، هەرچـی زاوای سـێەمیەتی بێرامـە بەگ بوو، کە لە دژی کوردان لەوانە جـەنگا و یـەکێ لـە فەرمانـدە سـەربازییەکانی

---

1- Ibid, P148-149.۳۹۷سفرنامه،ص.

٢- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە البدلیسی ص ٢٨٠- ٢٨٢ احسن التواریخ م.س/ ج ص ص٢٠٤رابعه ص ٢٦٤

بوو[1] . ئوستا جلو محەمەد رۆڵی گرینگی بۆ سەفەوی لەناوچەکە هەبوو، لەم رووەوە بازرگانی ڤینیسیاییا لەبارەی هاوسەرێتی سیاسی شائیسماعیل روونی کردۆتەوە پیاوێکی زیرەك و تێگەیشتوو بوو و زوو هەستی بە گرفتەکانی کردووە ، و ئەوەی بۆ پاراستنی مەملەکەتەکەی پێویست بوو کردوویەتی ، لە بەرسەرەکەی حکوومەتی دیاربەکرو حەسنکێف زۆر گرینگ بوون، بۆیە خوشکی خۆی داوەتە ئەو فەرماندە و میرە کورد لەبارەی ئوستا جلو شەوە باس کردووە کە خەڵکی ئەنادۆڵەو یەکێکە لە هەوادارە توندەکاتنی سەفەوی و بیروباوەری پاکەو فیداکاری شائیسماعیلە[2] .

هەرچی بێرەم بەگە یەکێ لە فەرماندە سەربازییە گرینگەکانی شا ئیسماعیلەو بە ۱۰۰۰۰ دە هەزار سەرباز هێرشی کردۆتە سەر وان و دواجار داگیری کردووە. کە نەیتوانیوە میری ئەوێ بگرێ، دڵتەنگ بووە شا ئیسماعیلی بێرەم بەگی بۆ شەڕ شەماخی ناردووە لەگەڵ ئەوەی شا ئیسماعیل خوشکی خۆی دابوو بە میری حەسنکێف، بەلاّم لێشی دڵنیا نەبوو[3]، بازرگانی ڤینیسیایی باسی لەوە کردووە ، میر خەلیل میری حەسنکێفی شاری شاهانە و شاری گەورەی هەرێمی دیاربەکر میری ناوچەکەو دەوروبەریەتی ئوستا جلوی هاوەڵزاوای کەسەخت هەواداری سەفەوییە، بە فەرمانی شا تەواوی سەرکردەکاتنی هەرێمەکەی کۆکردۆتەوە و بە دە هەزار سەرباز هێرشی کردۆتەوە سەر من کێفا، لەو هێرشەدا ئوستا جلو زۆر هەوڵی داوە داگیری بکات، نەیتوانیوە شەو رۆژیان بەسەریەکەوە ناوە و بە دەوری قەلاّکۆ بوونەوە سەرکەوتوو نەبوون، بازرگانی ڤینیسیایی باسی بە وردی باسی لە ئەنجامی شەڕەکە نەکردووە کە تیایدا ئوستا جلو پشتی بە تۆپ بەستووە و هێرشی کردۆتەوە سەر حەسنکێف هەروەها لەوە دواوە کە قەلاّ زۆر سەختە و خەڵکی زۆر کوژراون و چووە تۆپەکانیشی ببینی ، کەچی باسی لەسەرئەنجامی سوڵتانی خەلیل نەکردووە. وەك

---

1 - Ibid, P.152 P202 ..سفرنامە،ص۳۹۰،ص۴۵۲

2- Ibid, P.152..سفرنامە،ص۳۹۱

3 - Ibid, P.160-163.P202-203 ..سفرنامە،ص۴۰۱-۴۰۴.ص۴۵۲-۴۵۳

دەردەکەوێ ئوستا جلوی محەمەد بەهەر جۆرێ بوو، پارەی زۆری خەرج کـردوو تـا بـە لەشکرەکەی بدا شارەکە بگرێ، چونکە لە هەردوو لا زۆر کوژرا و هەبوون[1].

لە چاپتەری حەڤدەدا باس لەوە کردووە کە هەرێمی دیاربـەکر بـەردەوام سـەر بـە ئێران بووە کە ئیسماعیل هاتـە سـەرتەخت، ویسـتی تـەواوی ولاتەکـەی بخاتـە ژێـر دەسەلاتی سولتان خەلیل بـۆ خـۆی چـووە لای و کـلاوی سـووری لەسـەرنا، ئـەویش پاداشتی زۆری سولتان خەلیلیش بە دلخۆشییەوە گەڕایەوە حەسـنکێف، لەبەرئـەوەی سولتان خەلیل بە گـوێی شائیسـماعیلی نـەکردوو ، نیـازی ئـەوەی هـەبوو تـەواوی هەرێمی دیاربەکر لەژێر فەرمانی ئوسـتا جلـوی بهێنێتـە دەر، پـەیامی بـۆ سـولتان خەلیل نارد کە شارو قەلا تەسلیمی ئوستاجلو بکات، ئـەویش بـە گـوێی نـەکرد لـە سالی (١٥١٠ز – ٩١٥/ ٩١٦ هـ) ئوسـتا جلـو بـە دە هـەزار سـەربازەوە لـە دژی جەنگی راگەیاند، بەلام نەیتوانی زەفەری پێ ببات ئەو کات بازرگانی ڤینیسیایی لـە عێراقی عەجەمەوە هاتبووە ئەو هەرێمە،[2] کەچی شەرەفخانی بەدلیسی باسـی لـەوە کردووە، کە شا ئیسماعیل دەسەلاتی ئاق قۆیۆنلوی لەناوبرد، میرە کوردەکان روویـان تێکرد، ئەویش زیندانی کردن، لەبەرئەوەی مەلیك خەلیل و میری بەدلیسی رێبـەری هەمووانیان کردبوو، ئازاد نەکران، لە ئاکامدا ئەمە وایکرد کارگێڕی حەسنکێف لـە لایەن هۆزی بوختی بەڕێوە ببرێت... هەر لە سـەرەتای ململانێیـەکان و گرژییـەکانی نێوان سەفەوی و عوسمانی مەلیك خەلیل لە زیندانی سەفەوی رایکردووە[3]، بازرگـانی ڤینیسیایی لـە باسـی ئەرزنـدا گوتوویـەتی دەسـەلاتدارەکەی پیـاوێکی بالابـەرزە و موسلمانە و لە پیرەوانی شا ئیسماعیلە و ناوی قەنبەر بەگە و پیاوێکی کەتەی زلەیە شا ئیسماعیل پێی دەلێ سولتان ملکەچی ئوستا جلویە[4].

1 - Ibid, P.151-152.P154 ..٣٩٣، ص٣٩٠-٣٩١سفرنامە،ص

2 - Ibid, P.194-195.٤٤٣-٤٤٢سفرنامە،ص.

٣ - البدليسى ص٣١٩-٣٢٠. ٦٥٦منوچهر پارسا:ص٤٠٠ رابع ص٢٣٣.

4 - Ibid, P.156.٣٩٦سفرنامە،ص.

هەرچی شەرەفخانی بەدلیسییە لەبارەی ئەرزن وەکو ناوچە باسی لەوە کردووە، میرانی ساسۆن لە ئامۆزای میرانی بەدلیسن، هاتوونەتە ئەو ناوچانەی ئەرزن و دەوروبەری، کە لە چەند هۆزێکی دیکەی حەسنکێفەوە وەریان گرتووە و خستوویانەتە سەر قەڵەمڕەوەکەیان، هەروەها لەبارەی میرانی ساسۆن، کە بە (حەزۆ) ناسراون، شەرەفخان باسی لەوە کردووە، کە لە سەردەمی هاتنە سەر کاری سەفەوییەکان میر عەلی لەگەڵ میرەکانی دیکە لەلایەن شا ئیسماعیلە دەستگیرکراوە و خراوەتە کونجی گرتیگەوە، دواجار لە تەورێز گیانی سپاردووە، پاشان خێڵ و هۆزەکانی ئەوێندەر خدر بەگیان لە شوێنی داناوە، لە کاتێکدا برا گەورەکەی محەمەد بەگ لای شا ئیسماعیل هەوڵی داوە بێتە جێگەی باوکی، بازرگانی ڤینیسیایی لەو سەردەمەدا باسی لەوە کردووە ساسۆن، سەر بە حەسنکێفە، بەڵام روونی نەکردۆتە کێ حوکمی کردووە، لە کاتێکدا شەرەفخانیش باسی لەوە کردووە کە ساسۆن و ئەرزن سەر بە حەسنکێفن[1].

## دووەم: ململانێی روو بەروو

لە دوو بارەدا شا ئیسماعیل رووبەڕوو لەگەڵ قەوارە کوردییەکان کەوتۆتە ململانێ، بەرامبەریان هەمان سیاسەتی ئاق قۆیۆنلوی هەبوو، لەبارەی یەکەمیانەوە، هەروەها لەبارەی دووەمدا دانی بە سەربەخۆیی ناوخۆی میرنشینەکە ناوە، کەچی دواتر هێرشی بۆ بردوون، بەبێ ئەوەی دان بەو سەربەخۆییە بنێ.

بازرگانی ڤینیسیایی لەبارەی پێوەندیی میرنشینی بەدلیسی بە سەفەوییەوە سەرەتا باسی لەوە کردووە، کە کوردێك ناوی سیراج بەگە، هەم دەسەڵاتداری شار و هەم هی قەڵاکە بوو، سیراج بەگ لە بەرانبەر شا ئیسماعیل دا نیوە یاخییە، بۆیە لە ئێران دا ئەو بە فەرمانڕەوای ئەو قەڵا بەرزە دەناسن[2].

---

1- Ibid, P.156 .البدلیسی ص٣٦٣-٣٦٥ .سفرنامه،ص٣٩٦

2- Ibid, P.157. .سفرنامه،ص٣٩٧

هەروەها روونی کردۆتەوە، کە ئەو کوردە واتا سـیراج بـەگ[1] فـەرمانڕەوای شـار، رووی لە سوڵتان شێخ ئیسماعیل نەناوە، لە بیرمە ئەو کاتەی لە تـەورێز بـووم، شـا چەند جار ناردی بە شوێنیدا تا بێـتە دەربار، بەڵام نەچووە دەرباری شا، لەبەرئـەوەی شا ئیسماعیل یەکێك لە سەردارەکانی کە ناوی زەمان محەمەد بـەگ بـوو بـە شـەش هەزار سوارەوە بۆ جەنگ نارد، سوپاکە بەڕێ کەوتن، بەڵام ناردیان بە شـوێن زەمـان محەمەد بەگ کە بگەڕێتەوە تەورێز، چونکە شا دەیەوێت بۆ لایەکی دیکە بینێرێـت[2]، هەرچەندە هەر ئەوەندە لە پێوەندیی میرنشینی بەدلیسی و سەفەوی دواوە، بـەڵام بـە شێوەیەکی گشتیی سەرنجی گرینگی خسـتۆتە ڕوو، چـونکە زانیارییـە گرینگـەکانی بازرگانی ڤینیسیایی زانیاریی نوێ دەخاتـە سـەر کتـێبی شـەرەفخانی بەدلیسـی و دەوڵەمەندی دەکات، هەرچـەندە بازرگـانی ڤینیسـیایی لـە پێوەنـدیی نێـوان مـیری بەدلیس و ئوستاجلو نەدواوە، بەڵام هەروەك شەرەفخان ئاماژەی بە لەنگەرگرتنی شـا ئیسماعیل لە خوی و هێرشـی بـۆ سـەر قارەمـانی داوە، دواجـار بـەهۆی راپـۆرتی ئوستاجلو محەمەدەوە والی دیاربەکر پێوەندیی نێوان میرنشـینی بـەدلیس و سـەفەوی تێکچو، ئوستاجلو محەمەد لەو راپۆرتەدا هەواڵی بۆ شا ئیسـماعیل نـاردبوو، ئەگـەر کارگێڕی هەمایۆن شا ئیسماعیل ـ ی پڕ شکۆ میرەکانی کوردستان بخاتـە زیندانـەوە ئەو بەڵێن دەدا تەواوی کوردستان بخاتە مشتی، کە پاشـا و سـوڵتانەکانی پێشـووش ئەو کارەیان بۆ نەڕەخساوە کوردستان ملی پێ کـەچ بکـەن[3]، بازرگـانی ڤینیسـیایی لەبارەی "وستان و وان"ـەوە دواوە، لە سـەرەتادا، کـە گەیشـتۆتە وان باسـی لـەوە کردووە، ئەو قەڵایەی بەدەستی شا ئیسـماعیل چـێ کـراوە، هـەروەها دانیشـتووانی دەوروپشتیشی هەموویان کوردن، وانیش رۆژە رێیەك لە وستان دوورە لەوێدا میرێك،

---

١- بازرگانی ڤینیسیایی نووسیوویە sararas bec وەرگێڕی فارسی ئاماژەی داوە رەنگـە سـیراج بـەگ بـوو بیص٣٩٥

2- Ibid, P.158.٢٦٣-٢٦٢سفرنامە، ص ٣٩٨ التراث الكردي فی المؤلفات الایطالیین: ص.

٣- البدلیسی ٦٥٦- ٦٥٧ راجع ٢٤٥- ٢٤٦

که ناوی "زەیدی بەگ"[١]ـە حوکمڕانی وان دەکات و لە بنەماڵـەی میرانـە و چـەندان کوڕی هەن، کە لە دەوروبەری وان دا حوکم دەگێڕن و رووی لە شا ئیسماعیل نەناوە و ملکەچی فەرمانەکانی نەبووە، شا دوای ماوەیەك یەکێك لە سەردارەکانی، کە نـاوی "بێرام بەگ"ـە بە دە هـەزار سـەربازەوە هـەروەك چـۆن وان و وسـتان زۆر پێکـەوە باسکراون[٢] لەبەرئەوە گەلێ جاران لەو سەردەمەدا سەر بەیەك فـەرمانڕەوای سیاسـی بوون، لێرەدا بازرگانی ڤینیسیایی باسی کردووە خاوەنی وان پشتی لە شا ئیسـماعیل کردووە وێران کراوە، بۆیە پێدەچێ وێرانکردنی وستان پێوەندیی بە وانەوە هەبوو بـێ، لە کاتێکدا شا ئیسماعیل ویستویەتی رێگە بۆ هێرشکردنە سەر وان خـۆش بکـات، چونکە بازرگانی ڤینیسیایی لەبارەی هەڵوێستی میر زەیدی بەگەوە هەر لە سـەرەتاوە بەرانبەر شا ئیسماعیل توندبووە، دواتر بازرگـانی ڤینیسـیایی وەك خـۆی ئامـاژەی پێداوە. لە تەورێز بووە باسی داگیرکردنی ئەو قەڵایەی لەو سەربازانە بیستووە، کە لە شەڕ گەڕاونەتەوە بەتایبەتی لە فەرماندەی تۆپخانە، کە ناوی موسـا بـەگ ترابزۆنـی بووە[٣]، ئەمەش دەریدەخات لەلایەکەوە هەرچەندە بازرگانی ڤینیسیایی گەواهیـدەری ململانێی ئەو میرە و سەفەوی بووە، بەڵام دواجار هێرشبردنە سـەری لـە سـەربازانی سەفەوییەوە بیستووە، لەلایەکی دیکەوە هێرشکردن بە دە هـەزار سـەربازەوە، ئـەوە دەیسەلمێنێ، کە ئەو میرە کوردە لە ململانێی کورد و سەفەوی دا پایەیەکی فرەوانـی هـەبووە، سـەرباری ئـەوەی سـەفەوی لـە رووی چـەك و تفاقـەوە زۆر لـە کـورد پێشکەوتووتربووە.

بازرگانی ڤینیسیایی بە وردی باسی لەو فێڵ و رووبەڕووبوونانە کـردووە، کـە لـە هێرشی سەفەوی بۆ سەر زێدی بەگ کەوتۆتەوە، هەرچەندە بێرام بەگ دواجار قەڵاکەی

١ - بازرگانی ڤینیسیایی نووسیبووی، (zidibec) کەچـی وەرگێـڕی فارسـی باسـی لـەوە کـردووە، کـە لـە مێژوونووسە فارسەکان (هاوچەرخی) نووسیویانە سارم تی کورد، p161 ص٤٠١.

٢ -(بڕوانە) البدلیسی ص٥٧٤. رابعەل٢٣٣-٢٣٥.

3- Ibid, P.161.٤٠٢-٤٠١سفرنامە،ص.

داگیرکردووه، بەڵام نەیتوانیوە زێدی بەگ و خانەوادەکەی دەستگیر بکـات. ئەمـەش بێرام بەگی دڵتەنگ کردووه، دوای گەڕانەوەیان شا ئیسـماعیل لـە تـەوریز جـەژن و شادیی سازکردووه. لە راستیدا ئەو هێرشـە بەرفرەوانـەی شـا ئیسـماعیل بـۆ سـەر میرێکی کورد بـە گـوێرەی گێڕانـەوەی بازرگـانی ڤینیسـیایی بـەر لـەوە بـووە شـا ئیسماعیل لەگەڵ گەورە و بەرپرسان بچێـتە خۆی و لەوێ ئوردوگـە دابنـێ، چـونکە هەر دواتر باسی لەوە کردووه شا ئیسماعیل چووەتە خۆی و لەوێ خەریکی ڕاووشکار بووه[1]، ئەمانەش دەریدەخەن شـا ئیسـماعیل لـەو بەرنامەیـەی بـۆ داگیرکردنـەوەی کوردستان و ناوەندیی میرنشـینە کوردییـەکان هـەیبووه، یەکـەمجار بـۆ ئـەو میرانـە هێرشی بردووه، کە بە ئاشکرا دژ بە مەزهەب و دەسـەڵاتی سـەفەوی وەسـتاون، لـە راستیدا ئەگەر بمانەوێ لە سـەرەتای سـەدەی ١٠ ل / ١٦ ز ئـەو وێنەیـەی لـەبارەی میرنشینێك لە وان و دەوروبەری دەستمان بکەوێ، رەنگە لە سەرچاوەکانی دیکـە تـا ڕادەیەك قورس بێ، چونکە بازرگـانی ڤینیسـیایی زۆر بـە هێـزەوە باسـی کـردووه، هەرچەندە باسی نەکردووه، کە ئاخۆ پێوەندیی لەگەڵ میرەکـانی دیکـەی دەوروبـەری هەبووه، بەڵام کورەکانی لە ناوچـەکانی دەوروبـەری وان حـوکمڕان بـوون، بۆیـە ئـەو زانیارییانە بەو شێوەیە لە شەرەفنامەش دەستناکەون، لـەبارەی قـەڵای "وان"ـەوە، شەرەفخان بە جۆرێك باسی کردووه، کە لە نیـوەی دووەمـی سـەدەی ٩ ل / ١٥ بـە دواوە بەردەوام جێگەی ململانێی بووه، لە نێوان میرنشینی هەکاری و حەسـنکێف و بەدلیس[2]، هەروەها ئەبو بەکر تارانیش لـە کتێبـە بـە نرخەکـەی دا، لـە سـەردەمی دەسەڵاتدارێتی قەرە قۆیۆنلو وەکو میرێکی سەربەخۆ لـە وان دواوە، بـە بـێ ئـەوەی ناوی میرەکەی بهێنێ[3].

---

1- Ibid, P.163-164.سفرنامە،ص٤٠٣-٤٠٤.

٢ - البدلیسی:٢٤٨،٢٤٦-٣١٥،٣٠٣،٢٤٩.

٣ - کتێبی دیاربکرییە،ل١١٨-١١٩.

سەرچاوە سەفەوییەکانیش بەتایبەتی ئەسکەندەر بەگ تورکمان لەو بارەوە دواوە، کە بێرامە بەگ بە فەرمانی شا ئیسماعیل چووەتە شەڕی (سارمی کورد ـ زەبدی بەگ)، لەو شەڕەشدا گەلێ لە سەردار و سەرکردەی سەفەوی کوژران، ئەسکەندەرێك ئەم رووداوانەی لە ساڵی ٩١٨ ك/ ١٠٥٦ باس کردووە[١]، هەرچەندە ئەگەر شا ئیسماعیل سەرەتا دانی نابێ بە سەربەخۆیی میرنشینە کوردییەکان، بەڵام دواتر هێرشی بۆ بردوون، میرنشینی حەسنکێف نموونەیەکی روونی ئەو بارەیە، شا ئیسماعیل سەرەتا خوشکی خۆی دا بە سوڵتان خەلیلی میری حەسنکێف[٢].

بازرگانی ڤینیسیایی هەمان تێڕوانینی سەفەوی بەرامبەر سوڵتان خەلیل هەیە، لەبەرئەوە لەو کاتەی ئوستاجلوی والی دیاربەکر هێرش بۆ حەسنکێف بردووە، ئەو باسی لەوە کردووە، کە میری حەسنکێف ملکەچی شا ئیسماعیل نەبووە و هەوڵی داوە تەواوی هەرێمی دیاربەکر لەژێر فەرمانی ئوستاجلو دەربهێنێ، شا ئیسماعیلیش بڕیاری داوە شار و قەڵا ڕادەستی ئوستا جلو بکات، ئەویش رازی نەبوو ڕادەستی بکات، ئوستا جلوش توڕە بووە و بە سوپایەکی دە هەزار سەربازەوە لە ساڵی (٩١٥-٩١٦ه/ ١٥١٠) هێرشی بۆ بردووە و نەیتوانیوە داگیری بکات[٣].

ئەوەی لێرەدا گرینگە بازرگانی ڤینیسیایی زانیاریی دیکەی خستۆتە پاڵ زانیارییەکانی شەرەفخان بەتایبەتی لە پێوەندیی نێوان سوڵتان خەلیل و ئوستاجلودا، چونکە ئوستا جلو هەستی بە مەترسی سوڵتان خەلیل لە ناوچەکە کردووە. دواجار بۆیە ئوستا جلو راپۆرتی بۆ شا ئیسماعیل ناردووە[٤].

ب- میرنشینە کوردییەکان.

---

١ - اسکندر بیگ ترکمان: تاریخ عالم ارای عباسی جلد١، ، چاپ گلشن، تهران١٣٥٠ه.ش،ص٣١.

2- Ibid, P.202.سفرنامه،ص٤٥٢.

3- Ibid, P.202 .ـ سفرنامه،ص٤٤٣.

4- Ibid, P.195 ..سفرنامه،ص٤٤٣.البدليسی:ص٦٥٧. رابعه ل٢٣٢.

بازرگانی ڤینیسیایی باسی لە میرنشینە گرینگەکانی بەر لە شەڕی چالدێران کردووە، هێندەی گرینگی بە پێوەندیی ئەو میرنشینانە لەگەڵ سەفەوی داوە، باسی لە پێوەندیی نێوان میرنشینەکان یاخۆ پێوەندیی ناوخۆیی، تەنانەت یەك میرنشینیشی نەکردووە، رەنگە ئەگەر کێشە یان گرفتێکی لەو شێوەیە هەبوایە، لێی بدوابایە چونکە نێزیکەی مانگێك یان زیاتر لەوێندەر ماوەتەوە، کەچی ئاماژەی پێ نەداوە ئەو خاڵە گرینگ و پڕ بایەخانەی بازرگانی ڤینیسیایی لەبارەی میرنشینە کوردییەکان باسی کردوون، دەتوانین بەم جۆرە بیانخەینە ڕوو: -

١- جۆری دەسەڵات و بیروڕایان
٢- قەڵەمڕۆیان لە رووی جوگرافییەوە
٣- پێوەندییان لەگەڵ دەسەڵاتی سەفەوی
٤- ناوهێنانیان هەروەك شەرەفخانیش باسی کردووە.

هەرچەندە ناوی میری جەزیرەی بەدلیسی نەهێناوە، بەڵام ئاماژەی داوە، کە لەگەڵ سەفەوییەکان ناکۆکە، سەبارەت بە حەسنکێف لە میر خەلیل دواوە، کە میرنشینەکەی لە شارێکی شاهانە و شاری گەورەی هەرێمی دیاربەکرە و سەرۆکی کوردانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ سەفەوییەکان زۆر ناکۆکن، چونکە لەو هەرێمە دەسەڵاتێکی بەرفرەوانی هەیە، لە راستیدا شەرەفخانیش لەوە دواوە، کە میر خەلیل لەگەڵ میری بەدلیس پاش سەرکەوتنی سەفەوییەکان، روویان لە شا ئیسماعیل کردووە و رێبەرایەتی میرە کوردەکانیان کردووە. لەو پێوەندییەدا ئەمەش بە هەمان شێوە باڵادەستی میری حەسنکێف دەسەپێنێ[1].

هەروەها لەبارەی قەڵای کیفەندوورگوتویەتی میرێکی کورد فەرمانڕەوای دەکات و سەر بە بەدلیسە، لە راستیدا کەم گەشتیار و بگرە مێژوونووسیش باسیان لەو قەڵایە کردووە، شەرەفخان ئاماژەی بەوە داوە، میر شەمسەدین شەرەف کوڕی میر شەمسەدین میری بەدلیس لە ماوەی حوکمڕانی قەرە قۆیۆنلو رۆژێکیان بۆ ڕاووشکار

---

١ - البدليسي: ص٣١٩-٣٢٠. رابعه ل٢٣٣.

دەرچووە عومەر یادگارانی دیوە، کە باری دارای لە کیفەندوور دەبو بەدلیس هێناوە، لەوێ روون دەبێتەوە کیفەندوور لە رووی سیاسی قەڵایەکە سەر بە بەدلیس هەروەها لە ململانێی سەفوی و عوسمانی لە ناوچەکە، میری بەدلیس قەڵای کیفەندوور و چەند قەڵایەکی دیکەی بە ڕۆژەکی سپاردووە، هەموو ئەمانە پاشکۆیەتی سیاسی قەڵای کیفەندوور روون دەکەنەوە[١].

هەروەها لە باسی قەڵەمڕەوی میرنشینی حەسنکێف لەوە دواوە، کە ئایخود و ساسون و ئەرزن سەر بە حکوومەتی حەسنکێفن، هەرچەندە حوکمڕانی ئەرزن لە پێڕەوانی ئوستا جلو[٢]ە، ئەمەش سەرەتای ململانێی مەلیك خەلیل میری حەسنکێف و ئوستاجلو دەردەخات، چونکە قەڵای ئەرزن سەر بەوە لە رووی جوگرافییەوە، کەچی قەنبەر بەگی سەفەوی حوکمی گێڕاوە.

لە شاری بەدلیس ئاماژەی بەوە داوە میر سیراج بەگ حوکمڕانی قەڵا و شارە و یەکێکە لە میرەکانی ناوچەکە، گەورەییەکەی بە جۆرێکە رووی لە شا ئیسماعیل نەناوە لە باسی میری وان، سەرباری ئەوەی باسی لە قەڵەمڕەوی کردووە، کە ناوچە و قەڵاکانی دەوروبەری وانی بەسەر کوڕەکانی دابەش کردووە، هەروەها گوتویەتی زەیدی بەگ لە بنەماڵەی میرانە و زۆر بە خۆی دەنازێ، بەناوی خۆی لە زێڕ و زیو و مس سکەی لێ داوە، ئەوەی تێبینی دەکرێ لێرەدا بازرگانی ڤینیسیایی دەریخستووە، کە میری وان سکەی بەناوی خۆی لێ داوە، هەرچەندە باسی پێوەندیی لەگەڵ میرە کوردەکانی دیکە نەکردووە، بەڵام هەموو ئەو خاڵانەی باسی کردوون، بوونەتە ململانێی قووڵی کورد و سەفەوی[٣].

---

١ - شرەفخان:ل٥٢٨، ٦٧٤

2- Ibid, P.156 ..سفرنامه،ص٣٩٦

3- Ibid, P. 157- 158.سفرنامه،ص٣٩٧. ٣٩٨

گومان لەوەدانییە سەفەرنامەی  بازرگانی ڤینیسیایی بەتایبەتی ئەو چاپتەر و شوێنانەی  تایبەتن بەکوردستان نێزیکەی نیوەی زیاتر لە زانیارییەکان، جوگرافیای مێژووین، لە مێژووی جیهانی ئیسلامی دا ولاّتناسە مەزنەکان لە رێگەی گەشتەکانیانەوە، جوگرافیای هەرێمە ئیسلامییەکان و دەوروبەریان نووسیوەتەوە (١٤)[١] بازرگانی ڤینیسیایی کاری بازرگانی بووە، کەچی زانیاریی زۆر وردی سەبارەت بە جوگرافیای مێژوویی هەرێمی دیاربەکر و دەوروبەری باس کردووە.

**ا- ناساندنی شار و قەلاّ**

بازرگانی ڤینیسیایی لە گەشتنامەکەی دا بۆ کوردستان لە رێگەی حەلەبەوە دەستی پێکردووە،  یەکەمین شار باسی کرد بێت بیرەیە (بیرەجك)، دواجار هەر بە رێگەی بیرە گەڕاوەتەوە حەلەب و بەم شێوەیە ناساندوویەتی: "لەحەلەبەوە سێ رۆژە رێ دوور شارێکی بچووکە، کەوتۆتە کەنارەکانی رووباری فورات، پێشتر قەلاّیەکی سەخت بووە. چەندین جار دەورەی گیراوە، نەتوانراوە دەستی بەسەردا بگیردرێ"[٢].

ئەولیا چەلەبیش بەم جۆرە ناساندوویەتی: قەلاّیەکە کەوتۆتە باشووری مەلایتە، کەشتی لە رووباری نێزیکییەوە هاتوچۆی کردووە و سەر بە جزیرەی گەورەیە[٣]

لەبارەی شاری ئورفە ناساندوویەتی دوو رۆژە رێ لە بیرە دوورە، شارێکی گەورەیە، لەناو شار قەلاّیەکی سەخت و دژوار هەیە، دیوارەکانی گەورە و پانوپۆڕن، شارێکی مێژووییە، جێگەی شایەکانە، گوندەکاتنی دەوروبەری تا بلێی خۆش و دلگیرن (١٦)[٤]

---

١ - حکیم احمد خوشناو: الکورد و بلادهم عند البلدانیین و الرحالە المسلمین ( ٢٣٢- ٦٢٥ھ/ ٨٤٦-١٢٢٩م) دار الزمان، ٢٠٠٩، ص ١٦-١٧.

2- MERCHANT of VINCE, Op.cit, p.142.

٣ - ئەولیا چەلەبی: کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا و: ناکام، ل٢٥، ٥٦ ،٧٠.

4- Ibid, p.142, 144.

هەروەها ئەولیا چـەلەپی وەكـو قەڵایـەك ناسـاندوویەتی، كـە سـوپاكەی لەگـەڵ شارەكانی دیكەی كوردستان لە ساڵی ٩٥٩ ل قەڵای والیان لە سەفەوی سەندۆتەوە[١]

لەبەرئەوەی بازرگانی ڤینیسیایی پێ بە پێ لە "بیره"وە بەرەو رۆژهەڵات و تەورێز هاتووە، بۆیە پاش ئورفە باسی قـەڵای جەمەلـەینی كـردووە، كـە دوو رۆژە رێ لـە ئورفەوە دوورە لەسـەر كێوێـك هەڵكـەوتووە، دیوارەكـانی پتـەو نـین، خەنـدەقێكی بچووكی هەیە، لە دەوروبەری قەڵا شارێكی لێیە[٢].جێگەی سەرنجیشە ئەولیا چـەلەبی باسی ئەو قەڵایەی نەكردووە.

هەروەها شاری ئامەدیشی بەم شێوەیە ناساندووە: "شارێكی گەورەیە، سێ رۆژە رێ لە قەڵای جەمەلەینەوە دوورە، شورەیەكی مێژوویی كـە دە تـا بیسـت میلـە بـە دەوریەوە سووراوەتەوە، دیوارەكەی لە بەردی رەش چێ كراوە، هەر دەڵێـی بۆیـەیان كردووە، لە تـەواوی شـاردا سـێ سـەد و شەسـت بـورج و كۆشـك هـەن"[٣] چـەند سـەدەیەكیش بـەر لـەوە وڵاتناسـە موسـڵمانەكان لـە شـوورەی پتـەوی ئامـەد و دیوارەكەی دواون، كە لە بەردی رەش و بە شێوەیەكی سەرسام چێ كراوە[٤].

هەرچی ئەولیا چەلەبی باسی لە قەڵای ئامەد و شاری ئامەد كـردووە و هـەتا لـە رووی مێژوویشەوە لێی دواوە، شار و قـەڵای ئامـەد سـەر بـە هـەرێمی دیاربـەكر و مەڵبەندی هەرێمەكەیە، لە باسی قەڵاكەشدا گوتوویەتی دیوارەكانی یەك گەز[٥]ی شـا بڵندن، لە ژێریشەوە دە گەزی بۆ كراوە بە بناخە، قەڵاكەش چـونكە بـە بـەردی رەش

---

١ - ئەولیا چەلەبی ل ١٤- ١٩١.

2- Ibid, p145.

هەروەها( فچل الله روزبهان خنجی)لەنێو قەڵاكانی دیاربەكر ناوی هێناوە. تاریخ عالم ارای امینی، بەكوشـش: مسعود شرقی، انتشارات خانوادە، ایران ،١٣٧٩ه.ش ، ص٩٤

3- Ibid, p145.

٤ - ابن حوقل: صوره الارچ، دار مكتبـه الحیـاه، بـیروت، ١٩٧٩، ص٢٠١ . لسـترنج: جغرافیـای تـاریخی سرزمینهای خلافت شرقی، مترجم: محمود عرفان ،تهران ،١٣٨٣ ه.ش، چاپ ششم، ص١١٧ .

٥ - گەز:

چێ کراوە ناوی قەرە ئامەدیان لێناوە، بە جۆرێك هەموو قوللە و ددانەکانی چاویان لە یەکدییە و لە کاتی گەمارۆدانا یەکدیی دەبینن و فریای یەك دەکەون[١].

پاش ئامەد بازرگانی ڤینیسیایی چووەتە قەلاّی ددو، بەم جۆرە باسی کردووە:" رۆژە رێیەك لە ئامەدەوە دوورە، لە شوێنێکی بلّندی نێزیك کێوێك هەلّکەوتووە، لە خوارەوەی چەندان گوند بەرچاو دەکەون، "جێگەی سەرنجە شەرەفخان و ئەولیا چەلەبی باسی ئەو قەلاّیەیان نەکردووە، کەچی بازرگان ئاماژەی بەوە داوە، ئەو قەلاّیە قەلاّیەکی سەختە و لە شوێنێکی بلّند هەلّکەوتووە و شاریشی لێیە و زۆر بەپیت و فەڕ و بەرەکەتە[٢].

لە ناساندنی ماردینیش دەبێژێت: "رۆژە رێیەك لە قەلاّی ددو دوورە، چوارچێوەی چوار تا پێنج میلە، کەوتۆتە سەر کێوێکی بلّند، لە خوارەوە تەماشای بکەی سەرسام دەبیت، لە خوار قەلاّکەوەش شارێك هەلّکەوتووە، دیوارەکانی تونـدوتۆلّ و پتەون، لەنێو شاردا کۆشك و مزگەوتی جوان چێ کراون"[٣].

شەرەفخان لە باسی ماردین دا زیاتر باسی لەوە کردووە، کە تەیموور لەنگ هێرشی کردۆتە سەر قەلاّکە و لە هەندێ باردا حوکمڕانی قەلاّکە باسی کردووە ،کە ململانێی لەگەلّ حەسنکێف هەبوو، هەروەها دواجار باسی لەوەش کردووە، کە سولّتان عوسمانی لە ماردینەوە بۆ باشوور چووە[٤].

ئەولیا چەلەبیش بەم جۆرە باسی کردووە، کە قەلاّیەکە لەسەر چیا هەلّکەوتووە، دوو قۆناخ لە دیجلەوە دوورە، لە تاریف کردن نایە، هێندە بەرزە دیواری بورجەکانی ژوور هەورەکان دەکەون، لە خوارەوە تا لووتکەی ژوور وی دوو فرسەخ[٥]ـە لە بورجەکانی قەلاّوە هەتا مەودای چوار قۆناخ بە هەر چوار لای خۆیدا دەبینرێ[٦].

---

١ - ئەولیا چەلەبی:ل٣٢، ٣٧-٣٩.

2 - MERCHANT of VINCE,Op.cit, p.149.٣٣٨ سفرنامە ص .

3- Ibid, p.149, 150.

٤ - البدلیسی ص ٢٧٧، ٣٠٧-٣١٣، ٦١٥، ٦٣٢.

٥ - فەرسەخ:

٦ - ئەولیا چەلەبی ل٧٢-٧٣.

دواتر جزیرەی ناساندووە:" کە دوو رۆژە رێ بەلای رۆژهەڵاتەوە لە ماردین دوورە، شارەکە وەکو جزیرەیەك رووباری دیجلە بە دەوری دا سووڕاوەتەوە، لەوێدا خەڵکەکەی خەریکی دروستکردنی قەڵایەکی سەختن، جزیرە ناکەوێتە سەر رێگەی دیاربەکر ـ تەورێز، بگرە بەلای رۆژهەڵاتییەتی"، هەروەها باسی لەوەش کردووە کوردێك حوکمی دەکات[1]. هەرچەندە بازرگانی ڤینیسیایی بە وردی لەو رووداوانە دواوە، کە لەو ماوەیەی لە حەسنکێف بووە، بەم شێوەیە باسی کردووە، کە چوار رۆژە رێ لە ماردینەوە دوورە، شارێکی شاهانەیە و شاری گەورەی هەرێمی دیاربەکرە، باسی لەوە کردووە سوڵتان خەلیلی کورد (نەوەی ئەیوبی) فەرمانڕەوایی کردووە، کە زاوای شا ئیسماعیل بووە، میرنشینێکی سەربەخۆ بووە[2]. رووبەرەکەیشی چوار تا پێنج میلە و لە دامێنی کێوێکی بڵند هەڵکەوتووە، جێگەکەی سەختە و رووباری مەزنی دیجلە بەرامبەر کێوەکەیە، شارەکە لە نێوان کێو و رووبار دروست کراوە[3].

ئەولیا چەلەبی ئەوها باسی کردووە، کە سەر بە دیاربەکرە، کەڵەك لە دیاربەکرەوە بۆ بەغدا و بەسرە لەسەر ئەو ئاوە — زێ یاخۆ ڕووبار بەژێر قەڵای کێفا و جزیرەدا شۆڕ دەبنەوە کە زێی دیجلەیە[4].

بازرگانی ناوبراو لە پێناسەی کەفەندو گوتویەتی:" لە حەسنکێفەوە پاش پێنج رۆژ سەفەر گەیشتمە کەفەندو، قەڵایەکی بچووکە، لەسەر لووتکەی کێوێك هەڵکەوتووە، تەواوی ئەو وڵاتە کوێستان و وشکە، لەبەرئەوە دەبینم لە حەسنکێف تا بەدلیس رێگەیەکی پڕ لە گردۆڵکە و تەنگەبەر و مەترسیداری هەیە"[5].

---

1 - Ibid, p. 150-151.

2 - Ibid, p. 151.

3 - Ibid, pp. 151-152.

٤ - ئەولیا چەلەبی:ل٣٦، ٤٥، ٨٨.

5 - Ibid, pp. 155-156.

ئەولیا چەلەبی بە وردی باسی ئەو قەڵایەی کردووە، کە لــە خــاکی کوردســتانە و ســولْتانی عوسمــانی پێشکەشــی میرانــی بەدلیســی کــردووە و خســتیە ســەر حکوومەتەکەی، ئێستە لەژێر دەستی خانی بەدلیس دایە، قەڵاکە لەنێو دۆڵێکدا لــە قەراغ رووبار لەسەر پارچە رەوەزێکی سەوز رەنگ چێ کراوە بچکۆڵەیە و خەرەنــدی نییە، یەك دەروازەی هەیە، لەنێوەوە مزگەوتێك و حەفتا هەشــتا مــاڵێکی تێدایــە و هیچی دیکە[1].

هەروەها لە وەسفی هەر سێ قەڵای (ئــایخو و ساســۆن و ئــەرزن) نووســیوویەتی و دەڵێت: "ســێ قــەڵای ســەخت لــەم دەڤــەرە بەرچــاو دەکــەون، هــەموویان ســەر بــە حکوومەتی حەسنکێفن"[2].

یاقوت حەمەوی لەبارەی ئەرزنەوە ناساندوویەتی، کە شــارێکە کەوتۆتــە بــاکوری رۆژئاوای دەریاچەی وان لە نێزیك خەلات[3]، هــەروەها شــەرەفخان لــەوە دواوە ئــەرزن سەر بە حەسنکێفە و دوازدە هەزار مەسیحی لێ دەژی، کە باج و سەرانە دەدەن و لە باسی ساسۆنیش لەوە دواوە زیاتر وەك مــیر و بنەماڵــەی حــوکمڕانی ساســۆنی بــاس کردوون و کە لە میرانی بەدلیسن، هەروەها جارێکی دیکــەش مــیری بەدلیســی لــە ململانێی شا تەهماسب[4] و عوسمانی میری وڵاتــی ساســۆن ئامۆژگارییــەکی داوە بــە میری بەدلیس[5].

لە ناساندنی بەدلیس دەبێژێت: "نە زۆر گەورەیە، نە شــوورەیان بــەدەوردا هەیــە، بەڵام لە ناوەڕاستی شار قەڵایەکی جوانیان لەســەر گردۆڵکەیــەك چــێ کــردووە، کــە

---

١ - ئەولیا چەلەبی: ل٩٧-٩٨.

2 - Ibid, p. 156.

٣ یاقوت الحموی: م.سز ج١ن ص١٥٠.

٤- شــا تەهماســب: کــوڕی گــەورەی شــا ئیســماعیلی ســەفەوی بــوو، لــە پــاش مــەرگی بــاوکی ســاڵی (٩٣٠ك/١٥٢٤ز) لە تەمەنێك کە لــە دە ســاڵ کــەمتر بــوو، دەســەڵاتی ئێرانــی گرتــە دەســت و لــە ســاڵی (٩٨٤ك/١٥٧٦ز) کۆچی دوایی کرد. رویمر: ص ٣٠٩.

٥ - البدلیسی: ص٣١٠، ٦٠٥، ٦٨٩.

فرەوان و دڵگیرە، بە گوێرەی هەواڵ و گێڕانەوەش ئەسکەندەری گەورە بونیاتی ناوە، قەڵاکە کۆشك و بورجی بڵندی هەیە، کوردێك ناوی سیراج بەگ بووە، حاکمی قەڵا و شارەکە بووە، ملکەچی شا ئیسماعیل نەبووە". شەرەفخانی بەدلیسیش دووپاتی کردۆتەوە، کە بەدلیس ئەسکەندەری رۆمی بنیادی ناوە[1].

شەرەفخانیش زۆر بە وردی باسی بەدلیسی کردووە، کە بەدلیس ئەسکەندەری رۆمی دروستی کردووە و لەوێ زێی دیجلە هەڵدەقوڵێ، هەندێ پێیان وایە لە سنووری هەرێمی ئازەربایجانە و هەندێکی دیکەش لەنێو هەرێمی ئەرمێنا حیسابی دەکەن، بەڵام جوگرافیناسان پێیان وایە لەنێو هەرێمی چوارەمە[2].

ئەولیا چەلەبیش سنووری بەم شێوەیە باسی کردووە، لای ڕۆژهەڵاتی وانە، هەروەها وستانیش هەیە لای باکوری شێروانە و لای قیبلەش هاوسنووری هێزانە و لە هەمان ئاراستەوە قۆناخێك دوور دەگاتە سنووری بەگی زرقی لای ڕۆژئاوا بە سێ قۆناخ دەگاتە بەگی حەزۆی سەر بە دیاربەکر، لای باکوری بە سێ رۆژان دەگاتە مەلازگردی سەر بە ئەرزەڕۆمە لای باکوری ڕۆژهەڵاتی سنجاقێکی وان بەگی ئەخلات لە رۆخی دەریا تەنیا ڕۆژهەڵاتی بێ پێوەندییە کە ئەویش دەریای وانە[3].

لە بارەی قەڵای تەدوانەوە (تەتوان) نووسیویەتی: " لە بەدلیسەوە بەڕێ کەوتم و رۆژی دووەم گەیشتمە تەدوان، قەڵایەکی بچووکە لەسەر کێوێ هەڵکەوتووە، دەریا لە پێشیەتی"[4].

لە ناساندنی دەریاچەی وان باسی لەوە کردووە، کە ئاوەکەی سوێرە، بەڵام سوێرییەکەی وەکو دەریای ئەدریاتیك[5] نییە، درێژایی سێ سەد میلە و پانایی لە پانترین شوێندا سەد و پەنجا میلە و دەوروبەری پڕە لە ئاوڕێژگە، بەلای رۆژهەڵاتییەوە

---

1- Ibid, p.157. البدلیسی: المصدر السابق،ص٥٦٩

٢ - البدلیسی: ص٥٦٩-٥٧٠.

٣- ل١٠٧.

4 - Ibid, p.159.

٥ - دەریای ئەدریاتیك:

چوار قەلاّ هەلّکەوتوون، کە ئەمانەن (تــەدوان، وســتان، وان و پــیگیر) هەرچــی ئــەو قەلاّیانەی بەلای رۆژئاواییەوەن ئەمانــەن (ئــەرگیش، ئابــل گیریــس، خــەلاّت)[١]. لــە ناساندنی خەلاّت نووسیویە:"وەکو لە بیناکانی دەردەکەویّ لە کۆندا شاریّکی گــەورە بووە، بەلاّم ئیّستە بووەتە قەلاّیــەکی بچــووك"[٢]. شــەرەفخان باســی کــردووە، ســالّی ٨٢٤ك حاکمی بەدلیس و ئەخلات میر شەمسەدین بووە[٣].

ئەولیا چەلەبی بە وردی باسی لە دروستبوون و بچــووکبوونەوە و دامەزراندنــەوەی شاری خەلاّت کردووە، پاش ئەوەی لە سالّی ٩٢٠ ك/ ١٥١٤ ز شای ئیّران بەرامبــەر سولّتان سەلیم بەرزی خەلّکی خەلاّت هاتنە لای سولّتان کە قەلاّیــەکیان بــۆ دروســت بکات، بەلاّم سولّتان سەلیم زۆر کەیفی بە قەلاّکردن نەدەهات[٤].

لە باسی وســتان گوتوویــە: "دوو رۆژە ڕێ لــە ئارمنــاك دوورە، بــە دەســتی شــا ئیسماعیلی سەفەوی ویّران بووە، تەنها شار و بازاڕەکەی ماوەتەوە، وستان لە لیّواری کەنداویّکی گەورەی دەریاچە هەلّکەوتووە"[٥].

شەرەفخان لە زۆرینەی ئەو رووداوانەی باسی وستانی کردووە، ناوی وانیشی لەگەلّ هیّنــاوە، لەبەرئــەوەی وســتان کەوتۆتــە باشــووری وان و لــە نیّزیــك دەریاچــەکەش هەلّکــەوتووە[٦]، "ئــەولیا چــەلەبی"یش بــەم شــیّوەیە ناســاندوویەتی، کــە کەوتۆتــە رۆژئاوای سەر بە هەکاری باسی کردووە[٧].

---

1 - Ibid, p p.159-160.

2 - Ibid, p.160.

٣ - البدليسى :ص٢٣٧

٤ - ل١٦١

5- Ibid, p.161.

٦ - البدليسيك ص٢٣٤، ٢٤٧، ٣١٤. رابعه ل٦٣.

٧ - ل١٠٧

سەبارەت بەوان باسی لەوە کردووە رۆژە رێیەك لە وستان دوورە، کەوتۆتە سەر کێویّ پڕە لە بەردی سەخت، رووبەرەکەی زیاتر لە میلێکە، بەڵام شوێنەکەی تەنگ و باریکە، حاکمەکەی کورد بووە وناوی زیدی بەگ بووە، سکەی بەناوی خۆی لێداوە[1].

شاری خوی بەم جۆرە ناساندووە:" لە شاری مەرەندەوە، ئەگەر سیّ رۆژ درێژە بە سەفەر بدەی بە دەشتێکی گەورە و دڵگیر دەگەیت، کە کێوی بڵند لەم نێوانەدا هەیە، لێرەدا شوێنێکی گەورە بە ناوی خوی بەرچاو دەکەویّ، لە رۆژگاری کۆندا شارێکی گەورە بووە"[2].لە وەسفی ئەزرنجان باسی ئەوەی کردووە، کە قەڵایەکە کەوتۆتە سەر سنووری ترابزون[3] و ئەنادۆڵ و ئێران[4].

یاقوت حەمەوی و ئیبن بەتووتە باسی ئەزرنجانجیان کردووە، کە شارۆکەیەکی ئاوەدانە لە وڵاتی ئەرمینیایە لە نێوان وڵاتی رۆم و خەڵات، نێزیکە لە ئەرزەرۆم[5].

هەروەها لە ناساندنی خەرپووت دەبێژێت: "شار و قەڵایەکی سەربەخۆیە و لەژێر قەڵەمڕۆی ئێران دایە"، بازرگانی ڤینیسیایی هەرچەندە چۆتە شاری مەلاتیەش، باسی ئەوەی نەکردووە، کە خەرپووت دوو رۆژە ریّ لە باشووری مەلاتیەیە، بۆ مەلاتیەش ئاماژەی بەوە داوە، کە سەر بە سوڵتانی دەوڵەتی مەمالیکە لە میسر (٦٤٨-٩٢٢ ك/١٢٥٠-١٥١٦ز)[6].

---

1 - Ibid, p.161.

2 - Ibid, p.164.

٣ - ترابزون: شارێکە لە ئاسیای بچووك، کەوتۆتە باشووری دەریای رەش، لە سەردەمی عەباسیدا گەورەترین گەورەترین مەڵبەندی بازرگانی بووە، دانیشتووانی ئەرمەن بوون. لسترنج:المصدر السابق، ص١٤٥.

4 - MERCHANT of VINCE,Op.cit, p.195

٥ - الحموی: م. س.ج١ ص١٤٩-١٥٠. ابن بگوگە: ص٢٩٨. رابعە ٤٠.

٦ - یاقوت الحموی معجم البلدان، قدم لها:محمد عبدارحمن المرعشلی دار احیاو التراپ العربی، بیروت،١٩٩٧، بیروت،١٩٩٧، گ١،ج٢، ص٣٥٥. Ibid, p.198.

ئەولیا چەلەبی دەڵێ، من خێرا رۆیشتم بە دوو رۆژە رێ لە مەلاتیەوە گەیشتمەوە خەرپووت، قەڵایەکە لە قەراغ ڕووباری فورات و سەر بە هەرێمی دیاربەکرە[1].

لە ناساندنی شار و قەڵا بۆمان دەردەکەوێ:

یەکەم: ئەو شار و قەڵایانەی باسی کردوون، لە سەرەتای سەدەی (١٠ك/١٦ز) قەوارەی سیاسییان لە شێوەی میرنشین بووە، کە رادەی سەربەخۆییان بەپێی دەسەڵات و هێزیانەوە بووە.

دووەم: ئەو شار و قەڵایانە لە گرینگترین شار و قەڵاکانی کوردستان بوون، کە ئاوەدان و قەرەباڵغ و جێگەی خێڵە کوردییەکان بوون[2].

سێیەم: بازرگانی ڤینیسیایی لە پێوانە و شوێنی شار و قەڵاکان دا، بیری تیژ و وردبین بووە، چونکە پێوانەی سەرنجەکانی زۆر لە هاوسەردەمەکانی خۆی نێزیکن، بگرە هێندە جیاوازییان نییە و سەرنجی گرینگ و پڕ بایەخی دەرخستووە.

## ب. پێکهاتەی کارگێڕی:

ئەو سەرنجانەی بازرگانی ڤینیسیایی لەبارەی پێکهاتەی کارگێڕییەوە خستوویەتییە ڕوو، زانیاریی ئاسایین رەنگە هێندێکیان پێوەندیدار بن بە ڕەوشی سیاسییەوە، بەڵام بە شێوەیەك بۆ خۆی لە دووتوێی سەفەرەکەی ئەم سەرەنجانەشی خستۆتە ڕوو.

سەبارەت بە هەرێمی دیاربەکر ئاماژەی بەوە داوە، کە شەش شاری گەورە و پێنج قەڵای فرەوانی هەیە، شارەکان برێتین لە ئورفە، ئامەد، ماردین، جزیرە، حەسنکێف و سعێرت[3]، قەڵاکانیشن ئەمانەن، جەمەلەین، ددو، ئەرزن، ئایخو و ساسۆن[4]، لە کۆتایی چاپتەری دووەم دا ئاماژەی بەوە داوە دیاربەکر یەکەمین هەرێمی ژێر

---

١ - ل٢٥، ٣٦.

٢ - بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:البدليسى: الكتاب الپالپ ص٣٢٥، الكتاب الرابع ص٥٦٧ .

٣ - سعێرت: قەڵا و شارۆکەیەکی سەر بە حەسنکێفە و لە ماردین نێزیکە. البدليسى: المصدر نفسه ، ص٣١٠، ٣١٩ .

4- MERCHANT of VINCE,Op.cit, p. 148,156.

دەسەڵاتی شا ئیسماعیلی سەفەوییە کە پێی دەگەی، شەش شاری گەورە و پێنج سەد قەڵای هەیە.

هەروەها باسی کردووە ئەو شارە (ئامەد) و هەموو ویلایەتەکانی دیاربەکر لەژێر دەسەڵاتی ئوستا جلو محەمەدە[1].

لەبارەی شاری بیرەوە باسی لەوە کردووە ئێستە سەر بە حکوومەتی سوڵتانی قاهیرەیە هەرچەندە پێشتر سەر بە ئێران بووە[2].

سەبارەت بە شاری ئورفە باسی لەوە کردووە، یەکەم شاری هەرێمەکەیە، کە لەژێر قەڵەمڕەوی شا ئیسماعیلە و شاری گەورە و مەڵبەندی هەرێمێکە کە ناوی دیاربەکرە[3].

هەروەها لە ناساندنی کەفەند و ئاماژەی بەوە کردووە، کە میرێکی کورد بەڕێوەی دەبات، کە لەژێر فەرمانڕەوایی بەدلیسە[4] و قەڵاکانی ئایخو و ساسۆن و ئەرزن سەر بە حەسنکێفن[5]، شاری خەرپووتیش لەگەڵ قەڵاکەی هەمیشە لەژێر قەڵەمڕەوی ئێران دا بووە[6]، شاری مەلاتیەش سەر بە سوڵتانی مەمالیکی میسر بووە[7]، شاری تەورێزیش تەورێزیش پایتەختی ئێران بووە[8].

لەگەڵ ئەوەی بازرگانی ڤینیسیایی باسی ئەو شارانەی کردووە، کە لە رووی ئیدارییەوە سەر بە دەوڵەتی ئێران یان میسرن، هەروەها باسی سنووری ئێرانی لەلای

---

1 - Ibid, p.145.

2 - Ibid, p.142سفرنامه ص۳۷۹ .

3 - Ibid, p.145.

4 - Ibid, p.155.

5 - Ibid, p.156.

6 - Ibid, p.195.

7 - Ibid, p.197.

8 - Ibid, pp.164-173.

دیار بەکرەوە کردووە، لە حەلەبەوە بۆ شاری بیرە سەر بە سولتانی مەمالیکی میسرە و بەلای رۆژهەلات تەواوی شار و قەلاکان لەژێر فەرمانی ئێران دا بووە[1].

هەروەها باسی تەورێزی پایتەختی ئێرانی کردووە، کە پێشتر بارەگەی داریوشی شای ئێران بووە و شوێنی شاکانی ئێرانە، لەوانەش ئوزون حەسەن و یەعقوبی کوڕی. هەروەها لەوە دواوە ماوەیەك خەرپووت بە دەست کوڕێکی عەلائولدەولە بووە و لەوێ حکوومڕانی کردووە، لەبارەی شاری مووسڵیشەوە، ناڕاستەوخۆ باسی کردووە ملکەچی بۆ سەفەوی نواندووە[2].

هەروەها باس لەوە کردووە مەرعەشی پایتەختی عەلائولدەولەیە

## ج . دانیشتووان:

لەگەڵ ئەوەی بازرگانی ڤینیسیایی پتر گرینگی بە خەڵکی مەسیحی داوە، بەلام ئاماژەی بە دانیشتووانی زۆرینەی ئەو شارانە داوە، کە پێیدا تێپەڕ بووە، بگرە هەندێ جار لەبارەی سەرژمێری مەسیحی و جوولەکان، تەنانەت زێدەڕۆیی زۆری کردووە.

لەبارەی دانیشتووانی شاری ئورفە باسی ئەوەی کردووە، کە دە تا دوازدە کلێسای مەڕمەڕی تێدایە، هەندێ کلێسای شارەکە بوونەتە مزگەوت[3]، ئەمەش ئاماژەیە، کە کە مەسیحی و موسڵمان لە ئورفە ژیاون.

سەبارەت بە شاری ئامەد لەگەڵ ئەوەی کلێسا گرینگەکانی باس کردووە، لەبارەی دانیشتووانی شارەکە نووسیویەتی: "لەم شارەدا دانیشتووانەکەی سەر بە فرە ئاینن، ئەوانی دیکە لە موسڵمانان زیاترن، کە بریتین لە مەسیحی و یۆنانی و ئەرمەنی و جوولەکان، پێڕەوانی هەر ئاینێك بۆ ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی پەرستن و سرووتی ئاینی خۆیان پەرستگەی جودایان هەیە، موسڵمانان ئازاریان نادەن". بازرگانی ناوبراو

---

1 - Ibid, p.142.

2 - Ibid, p195-198, 197, 196.سفرنامه ص ٤٠٧

3 - Ibid, p.144.

ئاماژەی بەوە داوە مەسیحی و یۆنـانی و ئەرمـەنی هـەن، دەبـێ ئـەوە بـزانین، کـە هەردووکیان مەسیحیین، کەچی گەشتیارێکی دیکەی رۆژئـاوایی (نیبـۆر) سـەبارەت بەمە گوتوویەتی: "مەسیحییەکانی دیاربەکر بە زۆری یەعقوبی یاخۆ کلدانین، بـەڵام جگە لەمانە ئەرمەنی و برێ نەستووریش هەن"[1].

ئەولیا چەلەبی باسی لەوە کردووە دانیشتووانەکەی کورد و تورکمـان و عـەرەب و عەجەمن، هەروەها ئەرمەنیشی تێدایە، خـەڵك بـە کـوردی و تـورکی و عـەرەبی و ئەرمەنی دەئاخڤن. باسی لەوەش کردووە زۆر غەریب دۆسـت و قسەخۆشـن، زۆر بـە تەنگ نامۆسی خۆیانەوەن[2].

بازرگانی نـاوبراویش دانیشـتووانی ماردینیشـی بـاس کـردووە، کـە ئەرمـەنیی مەسیحی و جوولەکان لە موسڵمانان زیاترن[3]

ئەولیا چەلەبی راستەوخۆ لە دانیشتووانی ماردین نەدواوە، بـەڵام ئامـاژەی داوە، کە ناو شارەکە زیاتر مەسیحین و دەرەوەشی چەندان گوندی کوردی تێدایە، سـەرباری ئەوەی گوندی تورکانیش هەن، هەروەها لەولاتر هۆزی عارەبانی – تەی – کۆچـەری هەن[4].

جێگەی سەرنجە بازرگانی ناوبراو زیاتر گرینگی بە پێکهاتەی دانیشتووان لە رووی ئاینییەوە دەدات، لەبەرئەوەی خۆی مەسیحی بووە، بە لاویـەوە گـرینگ بـووە هـەر شارێك چەندی مەسیحین و چەندی موسڵمانن، سەرباری ئەوەی کەم لای کردۆتەوە بـە دانیشتووانی گوندەکانتن، چونکە بۆ خۆی زیاتر لە شار و قەڵاکان ماوەتەوە.

---

Ibid, p.147. -1

کورد و کوردستان لە نیگای چەند گەڕیدەیەکی رۆژئاواییەوە: وەرگێڕانـی لـە تورکییـەوە، شـوکور مسـتەفا، دەزگەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠ ،ل٥٠

٢ - ل٦٤-٦٥.

3 - Ibid, pp.150-152.

٤ - ل ٧٢، ٧٤.

له جزیرەشدا سەرباری کورد دانیشتووانەکەی هەمان پێکهاتەی مـاردینی هەیـە، گەلێ نەژادی دیکە لێی نیشتەجێن، لەنێو حەسنکێفش دا ژمارەیەکی زۆر موسـڵمان و مەسیحی و جوولەکانی تێدایە[1].

له باسی جزیرەشدا ئەولیا چەلەبی ئاماژەی داوە بە شێوە زارەکانی زمانی کوردی و تێکیستێکی بە نموونە هێناوەتەوە[2].

لەبارەی دانیشتووانی بەدلیسەوە نووسیویەتی: "دانیشتووانی ئەم ناوچەیە کـوردن و لە یەك نەژادن، مەسیحی و ئەرمەنی بەفرەوانی هەن، لە دانیشـتووانی دەریاچـەی وان ئاماژەی بەوە داوە، دانیشتووانەکەی لە دەوروبەریدا کـە پـڕە لـە گونـد، پێشـتر زۆرینەیان ئەرمەنی بوون، دەوروبەری ئەم دەریاچەیە پڕە لە قەڵای سەخت کە کورد و ئەرمەن لێی دەژین"[3].

شــەرەفخان بــە وردی باســی رەچــەڵەك و دانیشــتووانەکەی کــردووە، گوتویــەتی دانیشتووانی بەدلیسی زۆرینەیان ئەرمــەن و موســڵمانن، موسـڵمانەکان پێـڕەوی لــە مەزهەبی ئیمامی شافعی دەکەن، جگە لە چەند کەسێك کە ژمارەیان کەمە و باوکان پێڕەوییان لە تورکی دەســەڵاتدار کـردووە، ئەمانــە پێـڕەوی لــە مەزهــەبی حەنــەفی دەکەن، هەروەها روونی دەکاتەوە، کە دانیشتووانی بەدلیس بەتایبەتی موسـڵمانەکان نێزیکەی تەواوی کوردن. لەم رووەوە ئەولیا چەلەبی ئاماژەی داوە زۆرینەی لە خێڵـی رۆژەکین و مەسیحی و عارەبانیش هەن[4].

لەبارەی دانیشتووانی وستان باسی لەوە کردووە، گوندانی گەلێ زۆرە، هــەموویان کوردن، هەرچی وانیشە پێشتر دانیشتووانی نێو قەڵا ئەرمــەنی بــوون، بــەڵام ئێســتە هەموویان کوردن و قەڵاکەش کوردێك بەناوی (زیــدی بــەگ) بــەڕێوەی دەبــات، کــە

---

1 - Ibid, pp.150-152.

٢ - ل٩١-٩٢.

3 - Ibid, pp.158-159.

٤ - البدليسي: ص ٥٧٦ . هەمان سرچاوە ل١٠٨- ١١٣.

سکەی بەناوی خۆی لێداوە. هەروەها شاری ئارمناك لەسەر دەریاچەیەکە، کە لەسەر دوورگەیەك هەڵکەوتووە، هەموویان ئەرمەنین[1]. دانیشتووانی تەورێزیش بە پلەی یەکەم ئێرانی و تورکمان لێی نیشتەجێ بوون، سەرباری ئەوانە ڕێژەیەکی زۆریش ئەرمەنی و مەسیحی هەن، هەروەها جوولەکەیش لێی نیشتەجێن[2].

لە گرینگترین ئەو خاڵانەی سەبارەت بە دانیشتووان بۆمان دەردەکەوێ:

یەکەم: زۆرینەی دانیشتووانی قەڵا و شارەکان لە رووی نەتەوەییەوە کورد بوون و لە رووی ئاینییەوەش موسڵمان و مەسیحی و جوولەکە بوون.

دووەم: زۆرینەی ئەو شار و قەڵایانەی راستەوخۆ لەلایەن میری کوردانەوە بەڕێوە براون باسی کوردانیان کردووە، کە لێی نیشتەجێ بوون، کەچی کەمتر لە شارەکانی دیکە ئاماژەی بەوە داوە.

سێیەم: لەبارەی دانیشتووانی گوندەکاتنەوە، ئاماژەی بەوە داوە، کە زۆرینەیان کوردن، ئەمەش هەمان ئەو سەرنجانەیە، کە شەرەفخان و ئەولیا چەلەبی لەبارەی هۆزە کوردییەکان خستوویانەتە ڕوو.

1 - Ibid, p.160.161.

٢- Ibid, p.171 بازرگانی ناوبراو ئاماژەی بەوە نەداوە، ئێرانی چ رەگەزێکن، گومان لەوەدا نییە کە بەر لە شاڵاوی هۆزە سەلجوقییەکان بۆ ئازەربیجان زۆرینەی دانیشتوانەکەی کورد بوون، تەورێزیش پایتەختی میرنشینی روادی کوردی (٣٤٣-٤٦٣ك/٩٥٤-١٠٧٠ز)بووە،دواتریش بۆتە پایتەختی میرنشینی ئەحمەدیلی (٥٠١-٦٢٤ك/١١٠٧-١٢٢٦ز)، مەڵبەندی نەتەوەی دیکە نەبووە،ل ەبەرئەوە دەبێ ئێرانی مەبەستی کورد بێت. بڕوانە بۆ: حسام الدین علی النقشبندی: ازربیجان(دراسه فی احوالهاالسیاسیه والحچاریه)،اگروحه دکتوراه(غ.م)،جامعه بغداد،١٩٨٤،ص٣٧-٣٨. نیشتمان بشیر:ا لکرد و السلاجقه، اگروحه دکتوراه،جامعه صلاح الدین،٢٠٠٠،ص٢٣- ٢٤، ٣٧-٣٨،٢٦٧-٢٧١. احمد عبدالعزیز محمود: الامارەالهزبانیه الکردیه فی ازربیجان واربیل.،مۆسسه موکریانی،اربیل،٢٠٠٢، ص٣٥، ٧٢ -٧٤.

بازرگانی ڤینیسیایی لەگەڵ ئەوەی کاری سەرەکیی بازرگانی بووە، لەبەرئەوە بابەتی ئابووری کەم تا زۆر بایەخی خۆی هەبووە، هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتیی هەردوو بابەتی بازرگانی و کشتوکاڵی باسی کردووە، لەو شارە کوردییانەی سەردانی کردوون تا ڕادەیەك سەرنجی خۆی خستووەتە ڕوو، باسی لە چالاکی ئابووریی کردووە و لە شاری تەورێزیش سەرنجی گرینگی لەبارەی بازرگانی و کشتوکاڵ و دواجار دەرەبەگ و باج داوە، ئەم سەرنجانەش بۆ بارودۆخی ئابووریی کوردستان بەشێوەیەکی گشتیی جێگەی بایەخە.

**أ. بازرگانی:**

لە راستیدا بازرگانیی ڤینیسیایی سەرباری چالاکی بازرگانیی تایبەتی خۆی، سەرنجی لە چالاکی بازرگانی لە کوردستانیش داوە تا ڕادەیەك ئەو ئاماژانەی کردووە، کە چالاکی بازرگانی بەهۆیەوە ئەنجام دراوە، لەگەڵ ئەوەی کوردستان تا ڕادەیەك بووەتە شوێنی ململانێی ئاق قۆیۆنلو و سەفەوییەکان یاخۆ شوێنی تێپەڕبوونی لەشکرکێشەکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی بووە، کەچی نەبووەتە هۆی پەککەوتنی چالاکیی بازرگانی.

بازرگانیی ڤینیسیایی دوو مانگ لە حەسنکێف ماوەتەوە و باسی ئەوەی کردووە خەڵکەکەی لە رووی مادییەوە توانایەکی باشیان هەیە و خەریکی کاری بازرگانین، خەڵکەکەی بە راستی زۆر باش و شایستەن و خەریکی سەوداییکردنن و لە بەشێکی دیکەی دەوروبەری شار خانوو و بازاڕێکی گەورە و چەند خان — کاروانسەرا — یان چێ کردووە، تاکو بازرگانان تیایدا بحەسێنەوە و بمێننەوە، گومان لەوەدا نییە دروستکردنی خانوو و کاروانسەرا لە شارەکان دا لە پێناو بزووتنەوە و چالاکی بازرگانی بووە، میر و میرزادەی کورد چەندین خان و کاروانسەرایان چێ کردووە تا یارمەتیی چالاکی بارزگانی بدەن.

بازرگانی ڤینیسیایی ئاماژەی بەوە داوە لە حەسنکێف شوێنی تایبەتی بۆ خان ـ کاروانسەرا ـ دروست کراوە، ئەو شوێنەش بازاڕێکی گەورەی لە خۆ گرتووە، گەر بتەوێ لە بازاڕەوە بچیتە شار دەبێ ئەو پردە مەزنە ببڕی، کە لەسەر رووبارەکە

دروست کراوه [١]، ئەمەش دەریدەخات چالاکی بازارگەریی لە حەسنکێف زۆر بەهێز بووە، تاکو ئەو پردە مەزنە بازارِ و شار پێکەوە ببەستێتەوە.

جێگەی ئاماژەپێدانە لەبارەی چالاکی بازرگانی ئەولیا چەلەبی ئاماژەی داوە، کە میری حەسنکێف (٢٠٣٩٥٥) ئاقچە[٢] سەرباری ئەوەی بازرگانی بە ڕێگەی کەڵەك بۆ بەغدا و شاری دیکە دەکریَ[٣].

بازرگانی ڤینیسیایی ماوەیەك لە خانی کەفەند و ماوەتەوە و لەوەش دواوە، کە گوندنشینانی کورد نان و خواردەمەنی و جۆ و ئالیك بە بەهای گران دەفرۆشن، ئەم وڵاتە لە بوونی ڕێگران پاکە، لەبەرئەوە ماوەیەك لەو (خان)ـە بووە، کەسێك ئاریشە و گرفتی بۆ چیَ نەکردووە. لەوەش دواوە، کە لەگەڵ یاوەر "کاروان باشی"ییەکەی گەلیَ ئەملا و ئەولای کردووە، سەرباری ئەو کەلوپەل و کاڵایانەی بە **نرخی دوو هەزار دوو قات بووە و لە حەسنکێف ماوە، ئەو سیَ هەزار دووکانی لیَ بووە**، هیچ گرفتێکی بۆ دروست نەبووە[٤].

هەروەها لەوە دواوە، کە گوندنشینانی وان و وستان بە ڕێژەیەکی زۆر هەنگوین بەرهەم دەهێنن، کە جارجار لەگەڵ پەنیر و ڕۆن بۆ فرۆشتن بۆ تەورێزیی دەنێرن، هەرچەندە شاری وستان ڕووبەڕووی وێرانکرای شا ئیسماعیل بۆتەوە، بەڵام شار و بازارەکەی ماوەتەوە[٥].

---

Ibid, pp.152-155.-1 - البدليسي: المصدر السابق ، ص ٣٥٠،ص٥٨٦ . مصطفى احمد النجار: شرفخان البدليسي و منهجه التاريخي من خلال كتابه شرفنامه، دار سبيريز، مطبعة حاجي هاشم، اربيل، ٢٠٠٧، ط١.ص١٨٨-١٨٩ .

٢ - ئاقضة:

٣ - ل٣٦-٣٧، ٥٤

4 - MERCHANT of VINCE, Op.cit, p.157.

5 - Ibid, p.161.

ئەوليا چەلەبی لەبارەی دانەوێڵە و کشتوکاڵی وان گوتویەتی میوە و بەرهەمی زۆرە و هەرزانە، حەوت جۆر گەنمی هەیە، حەوت جۆرە جۆی هەیە لە رەش و سپی و چەور و قەڵە، پاقلە و نۆك و دانەویلەی یەکجاریزۆرە [1].

لەگەڵ ئەمانەش بازرگانی ڤینیسیایی باسی لەوە کردووە، بازرگانان شاری بەدلیس بەجێ دێڵن، بۆ سەوداییکردن دەچنە حەلەب و تەورێز و بەسرە، چونکە بەدلیس شتێکی لێ نییە بۆ کڕین باش بێت، کاڵا لێرە نافرۆشرێ[2].

لە تەورێزیش چالاکی بازرگانی لەوپەڕی گەرمی دایە، بازرگانان لە کاروانسەرا دەمێننەوە، کە لە چەندین شاری وەکو بەغدا و کاشان و یەزدەوە روویان تێ کردووە، لەوێدا کوتاڵی ئاوریشم و هی دیکە، هەروەها مرواری و مسك، لازەوەرد و...هتد بەرچاو دەکەوێ، کە جۆرەکانی کوتاڵی لە حەلەب و بۆرسا و قوستەنتینییە هاوردە دەکەن و ئاوریشمی سوور لە تەورێزەوە بۆ حەلەب و بازاڕەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەبەن، لە بەرامبەردا کوتاڵ و زیو وەردەگرن[3].

لە سەرنجەکانی بازرگانی ڤینیسیایی بۆمان دەردەکەوێ، کە چالاکی بازرگانی بە شێوەیەکی سروشتی بەڕێوە چووە، میر و سەردارانی کورد خان و کاروانسەرایان چێ کردووە و بایەخیان پێداوە، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ برەودان بەو چالاکییە، هەندێ شار و قەڵای کورانی لەسەر رێگەی حەلەب ـ تەورێز بووە، کە خۆی لە خۆیدا گرینگیی شوێنی کوردستان لە چالاکی بازرگانی دا دەرخستووە، چونکە ئارامی و هێمنی کوردستان بە شێوەیەکی گشتیی چالاکی بازرگانی مسۆگەر کردووە، ئەمەش خاڵێکی ئەرێنییە بەلای "بازرگانی ڤینیسیایی"یەوە.

---

١ - ل٢١٩-٢٢٠.

2 - Ibid, p.158.
3 - Ibid, p.173.

**ب. كشتوكاڵ و باخداری:**

بەرئەنجامەكانی بازرگانی ناوبراو لەبارەی كشتوكاڵ و باخدارییەوە زیاتر سەرنجی كەسێكی گەڕیدەیە، بەڵام بۆ سەردەمی خۆی گرینگی هەیە، ئەم سەرنجانەش تا ڕادەیەكی زۆر لەبارەی بژێوی خەڵكی شار و گوندەكانەوە بەندە، ئەویش تا ڕادەیەك باسی لە چالاكی كشتوكاڵ و باخداری كردووە و بە میوە و میوەجات و بەرهەمی كوردستان سەرسام بووە، چەندین جار هەستی خۆی دەربڕیوە و باسی كردووە، ڕەز و باخیی گەورە و جوان لە دەوروبەری شاری ئورفە هەیە، كە بە شارەكەوە بەستراوەتەوە و هەر میوەیەكی بتەوێ دەستت دەكەوێ، هەروەسا ئاماژەی بۆ ئەوەش كردووە، كە لە خوارەوەی قەڵای ددو چەندان گوند بەرچاو دەكەون، كە پڕە لە نیعمەت، لە شاری جزیرەشدا هەر نیعمەت و میوەیەكی بتەوێ بە ڕێژەیەكی فرەوان دەستت دەكەوێ، لە شاری وان و وستانیش بە هەمان شێوە ئاووهەواكەی گونجاوە، بۆیە هەموو میوە و میوەجاتێك هەیە، بەرێژەیەكی فرەوان لەوێدا هەن و لە شاری سعێرتیش فندق و گوێز بەكار براون[1].

ئەولیا چەلەبی لەبارەی میوەی ئامەد گوتویەتی: "ئەو كاڵەكە بەستێنییانەی لێرە هەیە، بۆ خۆشی و شیرینی و هاوتای نییە، مەگەر كاڵەكی بۆتان بیگاتێ، "هەروەها سەبارەت بە ڕەز و باخەكانی بەدلیس باسی لەوە كردووە دە هەزار باخ لە بەدلیس هەیە، خەڵكەكەی ساڵی هەشت مانگ لەنێو باخەدا دەژین، باخی وا هەیە ساڵی دوو هەزار قروش داهاتییەتی، ئەو ڕەز و باخانەش لووتت پڕ دەكات لە بۆنی خۆش، ئەو ڕاڕەوی ڕەزانەش لە هەردوو لاوە داری مێویان خراوانەتە سەركەپر و هێشووی ترێیان پێدا شۆڕبۆتەوە، ڕۆیشتن بە ژێریاندا دڵی مرۆڤان دێنێتە جۆش و خرۆش[2].

هەروەها بازرگانی ناوبراو باسی دەغڵودانیشی كردووە، كە دەشتی ماردین و ئەرزنجان دوو دەشتی فرەوانن، دانەوێڵە لە كیفەندوور و ماردین و ئەرزنجان پشتیان

---

1- Ibid, p.145,149,151,157,161.

٢- ل٦٢، ١١٩ .

پێ بەستراوە، کەچی بارینی بەفری زۆر وایکردووە، دانەوێڵەکردن لە بەدلیس دوا بکەوێت، لە دەوروبەری تەورێزیش گەنم و جۆی زۆر کراوە[1].

جێگەی سەرنجە ئەبو بەکر تارانی مێژوونووسی دەرباری ئاق قۆیۆنلو لەوە دواوە لە ئامەد دەغڵودان کراو، هەروەها ناوچەکانی (هەتاخ، مێهری، چەموو شگەزەك، مووش، بیرە و نوسێبن دەغڵودانی لێکراوە، زۆرینەی دەڤەرەکانی کوردستان بە شێوەیەکی سەرەکیی پشتیان بە دانەوێڵە بەستووە لەوانە بەدلیس، خیزان، جزیرە و هی دیکە[2].

لەبارەی بەرهەمی دانەوێڵە شاری دیاربەکر ـ ئامەد ـ ئەولیا چەلەبی ئاماژەی داوە، کە شارەکە کەوتۆتە نێو بەردەڵان و رەقەنێك، بەڵام ناوچەکانی دەوروپشتی حەوت جۆر گەنمی دەنك درشت و جۆ و پاقلەی تێدا دەچێنرێت، کە سەماری دەئاقچەیە بەهۆی ئاوەدانی وڵاتەکەیەوە کێڵگە و زەوییەکانی زۆر بەپیت و فەڕن[3].

## ج– باج و سیستەمی زەوی:

بازرگانی ناوبراو لەبارەی باجەوە دواوە و لەم رووەوە زیاتر لە شاری تەورێز لە جۆرەکانی باج دواوە، وەنەبێ لە کوردستان پێڕەوی لەو جۆرە باجانە نەکرا بێ، کەچی ئەو زیاتر لەوێ باسی کردووە، بەتایبەتی هەندێ لەو باجانە بە خەڵکانی مەسیحییەوە بەندە ئەویش لێی دواوە.

١ - ابوبكر طهراني: كتاب دياربكرية، تصحيح: نجاتی لوغال و فاروق سومر، كتابخانه طهوري، طهران.١٣٥٦ه.ش. ج١،ص٢٦٣،١٠٥، ج٢ ص٣٨٧ ،٣٩٣.

٢ - ابو بكر طهراني:ج١ ص١٧٣، ص٢١٠، ص٢٤٦-٢٤٧، ص٢٥٤-٢٥٥ ج٢. ص٣٧١. البدليسي:ص٣٧٠-٣٧٣، ص٥٨٠-٥٨٤.

٣ - ل٦١ .

لــەبارەی بــاجی پەنادەرانــەوە لــەوە دواوە شێروانشــا پادشــای شــێروان[1] بــاجی پەنادەرانەی[2] بە شا ئیسماعیل داوە[3].

هەروەها باسی لەوە کردووە، ئوستا جلو محەمەد چووەتە سەر ماردین و ئەوێی بێ خوێنڕشتن گرتووە و خەڵکەکەی بەشــێوەی پــەنادەران تەســلیم بــوون[4]، پێدەچــێ ئــەم خۆڕادەستن بوونەش هەر ئەو شێوازەی باجی پەنادەرانە بێ، کە لــەو ســەردەمەدا بــاو بووە، جێگەی سەرنجە ئەبوبەکر تارانی مێژوونووسیش باسی لەو باجــە کــردووە، کــە مەلیك خەلەفی حەسنکێف داوەیە بە ئوزون حەسەن تــا واز لــە داگیرکردنــی قــەڵای کێفا بێنێ[5].

بازرگــانی ڤینیســیایی ئامــاژەی داوە بــەوەی لــە سەرتاســەری ئێــران رێــوڕەسمی تیولداری[6]، بەڕێوە دەچێت، گومان لــەوەدا نییــە لــەو ماوەیــەدا دەوڵــەتی ســەفەوی

---

١ - شێروان: ویلایەتێکە سەر بە هەرێمی ئازەربایجان لە کەناری رۆژئاوای دەریای قەزوین هەڵکەوتووە، ســەر بە دەربەند (باب الابواب) بووە. یاقوت الحموی: المصدر السابق، ج٣، ص٣٣٥.

٢ - باجی تەناهی یاخۆ پەنادەرانە (مال الامان): باجی پەنادەرانە بەسەر ئەو شار و قەڵایانە سەپێنراوە، کــە یان بەرگرییان کردووە و گیراون یاخۆ ئەوەتا خۆیان بەدەستەوە داوە، لە هەردوو باردا لە پێناو پاراستنی ســەر و ماڵی و گیانیان باجیان داوە، ئەم باجەش لە سەردەمی تەیمووری لەنگ هاتۆتە ئاراوە.جاسم مهاوی حســین: تاریخ الغزو التیموری للعراق و الشام و اپارە السیاســیە ١٣٨٥_١٤٠٥م رســالە ماجســتیر (غ.م) ، جامعــە بغداد،١٩٧٦م، ص٤٠٥.

3 - MERCHANT of VINCE,Op.cit, p.202.

4 - Ibid, p.149.

٥ - ج١ ص٢٤١

٦ - تیولداری: لە دوو بەش پێکهاتووە، تیول وشەیەکی تورکییە، راسپاردنی موڵك یاخۆ عەقار لەلایەن پاشا و دەوڵەتەوە بە کەسانێ دەگەیەنێ، کە خاوەنەکەی بۆی هەبووە باج و خەرجەکەی بە شێوەیەکی کاتی بۆ خۆی بێ، بەشی دووەمی (دار) واتە هەبوون، خاوەن دەگەیەنێ، بەسەریەکەوە واتــە خــاوەن زەوی. ا.ل.س. لمتــون: مالك و زارع در ایران، ترجمە: منوچهر امیری. بنگاە ترجمە و نشر کتــاب، تهــران، ١٣٤٠ه.ش، چــاپ دوم، ص٢٠٦ . محمد معین :فرهنگ فارسی، جلد دوم، موسسە انتشــارات امیرکــبیر، تهــران، ١٣٧٦ه.ش، چــاپ یازدهم، ص١٩٨٧ .

پێویستی بەو جۆرە سیستەمە هەبووە، کە زەوی بە سەرداران و نۆکەرانی ببەخشێ بە بێ ئەوەی باجیان لێ وەرگرێ.

لەوە دواوە هەموو رەسم و باجەکانی تایبەت بە رێگە و گومرگ و دارایی لەلایەن کەسێکی تایبەتەوە سەرپەرشتی دەکرێ و بەڕێوە دەبرێ، رەسمەکانیش جۆریان هەن، هەر بازرگانێك، کە لە بازاڕدا دوکانێکی هەبوو بێ، بە گوێرەی دەستکەوت و کارەکەی رەسمی داوە یاخۆ پیشەکاران هەر یەکیان بەگوێرەی ئەو بارودۆخەی هەیەتی، پولیان داوە، ئافرەتانی بێ سەرپۆشیش ئەگەر لە شوێنە گشتییەکاندا هاتوچۆیان کرد بێ، بەپێی ئەوەی تا چەند جوانن پارەیان داوە، هەرچەندە جوانتربوو بن پارەی زیاتریان داوە[1].

سەبارەت بە گومرگیش ئەگەر مەسیحییەك هەر کالاّیەك بهێنێتە تەورێز، لە سەدا دەی کەلوپەلەکەی وەکو گومرگ لێ دەسێنن، کەچی ئەگەر موسڵمان ئەم کارەی ئەنجام بدایە، لە سەدا پێنجی لێ دەسەنن، بەلاّم ئەگەر کالاّکەی لە تەورێز دانەنێ، تەنها پێیدا تێپەڕ ببێت، ئەوا ئەو رێژەیەی لێ وەرناگرن، بگرە کالاّکەی دەکێشن، رێژەیەکی دیاریکراوی لێ دەسەنن[2].

هەرچی لەبارەی سیستەمی زەویشەوەیە دەوڵەتی سەفەوی تا ڕادەیەکی زۆر سیستەمی نیولداری پێڕەو کردووە، زەوی بەو کەسانە داوە، کە سوودیان بۆ دەوڵەتەکەی هەبووە، هەرچی سوود و دارایی زەوییەکە بۆ خۆی بووە لە بەرامبەر سالاّنە ئیلخانی[3]یەوە تاکو سەردەمی قاجار[4] درێژەی کێشاوە[5].

---

1 - MERCHANT of VINCE,Op.cit, p.172.

2 - Ibid, p.172-173.

٣ - ئیلخانی:

٤ - قاجاری

٥ -مالك و زارع در ایران

بازرگانی ڤینیسیایی هەروەك ناوەكەی بە خۆوەیـەتی، هێنـدە باسـی بـارودۆخی كۆمەڵایەتی كوردستانی نەكردووە، هەرچەندە ئەو لە بارودۆخێك هاتۆتـە كوردسـتان ململانێی دەسەڵات لە ئارادابووە، لەبەرئەوە هەندێ سەرنجی گشـتیی كۆمەڵایـەتی و ئاینی خستۆتە روو، ئەو سەرنجانەش یاخۆ ئەوەتا بە ئاشكرا خستۆیەتییە ڕوو یـاخود لە دووتۆیی باسی دیكە روونـی كردۆتـەوە. لـە گـرینگترین ئـەو خاڵانـەی ئامـاژەی پێكردوون ئەمانەن:

### أ. ئاشتەوایی نێوان پێڕەوانی نەتەوە و ئاینە جیاوازەكان:

بازرگانی ناوبراو لەو شـارە كوردییانـەی ماوەتـەوە، سـەرنجی گرینگـی لـەبارەی پێكهاتەی دانیشتووانەكەیەوە خسـتۆتەڕوو، لـە شـوێنەوارە ئاینـەكانیش دواوە، لـە شاری ئورفە لەوە دواوە، كە كانییەك لە لایەن موسڵمانان و مەسـیحییەكانەوە رێـزی لێ نراوە و بە پیرۆز سەیر كراوە[1]، ئەمەش لەگەڵ ئەوەی سـەرەتا لای مەسـیحییەكان پیرۆز بووە، بەڵام نەبووەتە كێشە و گرفت پـیرۆزی كانییەكـە لای هـەردوو پێڕەوانـی ئاینی وەك یەك بووە.

هەروەها لە شاری ئامەدیش چەندان كڵێسای لێ هـەبووە، كـە تیایـدا پیرۆزتـرین دروشمە ئاینەكانی مەسیحی لێ بووە، موسڵمانان رێزیـان لێ نـاوە[2]، ئـەم نەریتـەش هەر لە زووەوە لە دیاربەكر هەبووە، ئەولیا چەلەبی ئاماژەی بەوە دواوە، پاش ئەوەی دووبارە موسڵمانان قەڵاكەیان لە گـاوران سـەندەوە، بـەپێی پـەیمانێكی حـەوت خـاڵ خۆیان بە دەسـتەوەدا، لـەو خاڵانـە كڵێسـاكانی نـاو قـەڵا نـەڕوخێنرێت و نزرگـە و گۆڕستانەكانیان تێك نەدرێ و رێگە بە مێزەرە رەنگاو رەنگەكانیان بدرێ[3]، هـەر لـە شاری ئامەد بازرگانی ناوبراو باسی لەوە كردووە، گەلێ لە پێڕەونی ئاینـەكان لـەوێ دەژین، كە ژمارەی ئەوانی دیكە لە موسڵمانان پترە، ئەوانیش مەسیحی و یۆنـانی و

---

1- Ibid, p. 144.

2 - Ibid, p. 146-177٣٨٤.. سفرنامە ص

٣ - ل٣٢-٣٣.

ئەرمەنی و جووەکانن. پێڕەوانی هەر ئاینێ پەرستگەی خۆی هەیە، کە تایبەتە بە ئاینەکەی موسڵمانان هیچ ئازارێکیان نادەن[1].

هەروەها لە شاری ماردنیش پێڕەوانی هەرسێ ئاین موسڵمان و مەسیحی و جوولەکان چوونەتە پەرستگەی تایبەتی خۆیان و لە پەرستگەی خۆیان خەریکی ڕێو ڕەسمی ئاینی بوونە و هیچ یەکیان مافی ئەوی دیکەی زەوت نەکردووە. لە جزیرەش لە پاڵ کورد زۆر نەژادی دیکەش هەبوون[2]، هەموویان پێکەوە ژیاون، هەرچەندە روونی نەکردۆتەوە، ئەو نەژادانە تورك یاخۆ نەتەوەی دیکە بوون، یان هەر نەژادێکی دیکەن؟!.

لە باسی خەڵکی شاری حەسنکێف ـ یش باسی کردووە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە موسڵمانان و مەسیحی و جوولەکانی لێ دەژین، خەڵکەکەی بەبێ گرفت پێکەوە هەڵدەکەن و لە رووی مادییەوەش بە توانان[3].

لە بەدلیس و دەورووبەریدا کورد و نەتەوەکانی دیکە و مەسیحی لەتەك یەکدا ژیاون، باسی لەوە کردووە، لەتەك کورد ئەرمەنی لەوێ دەژین و زۆرن، لەوە دواوە لە رووی بژێوی لە موسڵمانان خراپترن، بەڵام ئەرمەنی ئەم شارە لەچاو ئەرمەنی شارانی دیکەی ئێران باشتر دەژین[4].

لە راستیدا ئەم خاڵە جێگەی سەرنجە، کە ئەرمەنی نێو کوردستان لە ئەرمەنی شوێنانی دیکەی ئێران باشتر دەژین، ئەمەش لێبوردەیی و ئاشتەوایی کورد و میرەکانیان دەسەلمێنێ.

---

1 - Ibid, p. 147سفرنامه ص۳۸۵، .

2 - Ibid, p. 150-151سفرنامه ص۳۸۹ .

3- Ibid, p. 152.

4 - Ibid, p. 158

ئەولیا چەلەبی باسی کردووە، یازدە گەڕەکی عارەبـان و مەسـیحی لـە بـەدلیس هەن، بەڵام لەم شارەدا جوولەکە و فەرەنگ و یۆنانی نییە، مەسیحییەکانی بـەدلیس بازرگانی زۆر قورس و دەوڵەمەندن[1].

بازرگانی ناوبراو لەبارەی قەڵای تەدوان و قەڵاکانی سەر دەریاچەی وان گوتویەتی: "گوندەکاتنی دەوروبەری زۆرینەیان ئەرمەنین و قەڵاکانیش کوردن و ئەرمەنی تێدان و پێکەوە دەژیـن. شـاری وانـیش زۆرینـەی خەڵکەکـەی ئەرمــەنی و نـاو قەڵاکەشـی هەموویان کوردن، دواجار لەبارەی خەڵکی شاری تەورێز باسی کردووە، زۆر لە ئێرانی و تورکمانی لێ دەژین، زۆرێك لە ئەرمەنی لە تەورێزن، ئیدی لە تەورێز بە دواوە یەك مەسیحی چییە نابینین، هەرچی لە ئاینی مەسیحی هەیە نایدۆزییەوە، جوولەکەش لە تەورێز هەن[2].

## ب- پەرستگە ئاینییەکان و پاراستنیان

ئەو رۆشنبیری و پاشخانە مەسیحییەی بازرگانی ڤینیسیایی هەیبووە، وایکردووە سەرباری ئەوەی هەندێ سەرنجی بیروباوەڕی مەسیحی داوە، لە هەمان کاتدا لـە هـەر شار و قەڵایـەك کڵێسـای بەرچـاو کـەوتبێ لێـی دواوە و بیناکـەی لەگـەڵ کڵێسـای هاوشێوە لە وڵاتەکەی بەراورد کردووە، هەروەها لەو شـار و قەڵایانـەدا هـەوڵی داوە ژمارەی دانیشتووانی مەسیحی بـەراورد بکـات لەگـەڵ موسـڵمانان یـاخود هـەموو پێڕەوانی ئاینی دیکەی لەگەڵ موسڵمان بەراورد کردووە، بە واتە نـەهاتووە قـەبارەی هەر یەکەیان بە جودا پیشان بدات و لەگەڵ یەکدییان بەراورد بکات، چـونکە روانـین بەو شێوەیەی دوایی زیاتر لە بابەتییانە نێزیکە، لە بابەتی پەرسـتگە ئاینییـەکانیش بە شێوەیەکی گشتیی لـە هەنـدێ شـار و قـەڵا ئامـاژەی بـە جوولەکـە داوە، بـەڵام ئاماژەی بە پەرستگەکەیان نـەداوە، لـە باسـی مزگەوتـەکانیش پـتر ئامـاژەی بـەو مزگەوتانە داوە، کە لەو شار و قەڵایـەدا کڵێسـاش هـەن، هـەروەها باسـی هەنـدێ

---

١- ل١١٠

2 - Ibid, p. 159, 161, 171.

کلێسای کردووە، کە بوونەتە مزگەوت و باسی کردووە هێشتا شوێنەواری کلێسا بەسەریەوە ماوە، هەموو ئەمانەش وابەستەگی ئاشکرای بیروباوەڕی مەسیحی بازرگانی ڤینیسیایی پیشان دەدەن.

لەبارەی مێژووی شاری ئورفەوە بەشێوەیەکی ئاینی لێی دواوە، هەر تەنیا ئەو گێڕانەوەی باسی کردووە، کە لە مێژوو و کولتووری مەسیحییەوە نێزیکە، باسی لەو کردووە، ئورفە سەر بە قەڵەمڕۆی نەمرود بووە، لە شارەکە قەڵایەك هەیە، کە دیوارەکانی زۆر پتە و قایمن و مێژووی ئەو کاتیان بەسەرەوە، لەناو قەڵاکەش دا دوو ستوونی زۆر جوان بەرچاو دەکەون، کە بەرزاییان وەکو ستوونەکانی گۆڕەپانی سان ماکۆ (مەرقوس)ـە، دەڵێن، نەمرود بتەکانی خۆی لەسەر ئەو ستوونانە داناوە، هەر لەو شارەدا ئیبراهیم باوکی ئێمە ویستویەتی کوڕەکەی خۆی ـ ئیسحاق ـ بۆ خودا بکاتە قوربانی[1]، لە راستیدا بازرگانی ناوبراو هەر ئەم دوو خاڵەی لەبارەی مێژووی ئورفە باس کردووە، کە لە تێڕوانێکی ئاینییەوە لێ روانیوە، هەرچی لەبارەی کلێساکانی ئورفەوە گوتویەتی، هەر لەو شوێنەدا کانیاوێکی زوڵاڵ هەبووە، ئاوەکەی هێندە زۆر بووە، حەوت ئاشی پێ گەڕاوە، مەسیحییەکان لەوێدا کلێسایەکیان بەناوی حەزرەتی ئیبراهیم چێ کردووە، کاتێکیش هێز و توانای مەسیحی پووکاوەتەوە، موسڵمانان ئەو کلێسایەیان کردۆتە مزگەوت تا ئەمڕۆش بە کانیاوەکە دەڵێن: "کانیی ئیبراهیم"، هەروەها باسی لەوە کردووە لە ئورفە دە دوازدە کلێسای مەڕمەڕی تێدایە وشە و دەستەواژەی من لە توانایان نییە وەسفیان بکەم[2].

جێگەی سەرنجە لە شاری ئورفە جگە لەو مزگەوتەی پێشتر کلێسا بووە، باسی لە هیچ مزگەوتێکی دیکە نەکردووە، لەگەڵ ئەوەش لەوێدا موسڵمانان بە توانان و خودان دەسەڵاتن، ئەم سەرنجەش لەو سەردەمدا بەندە بە وابەستەبوونیی ئاینی بازرگانی ناوبراو، لەبارەی کلێساکانی شاری ئامەد بە وردی باسی لە کلێساکانی کردووە، سەرەتا سەرسامی خۆی بۆ باڵەخانە و تەلارەکانی ئەوێندەر دەربڕیوە، کە

---

1 - Ibid, p. 143 سفرنامه ص۳۸۰

2 - Ibid, p. 144

دەهەمبەر ئەو شێوە ئەندازییە جوانانەی بـۆ بـورج و کۆشـکەکانی چـێ کـراون، بـۆ کەسێ لە ئەندازیاری نەزانێ دڵخۆش دەبێ، جوانیی باڵەخانەکانیش نیشانە و هێمـای سـەردەمە دەسـەڵاتدارەکان پیشـان دەدەن، لـە ئامـەد زۆر کڵێسـای سـەرنڕاکێش و سەرسامکەر و کۆشك و باڵەخانەی جوان بەرچاو دەکەن، کە زۆرینەیان لە مـەڕ مـەڕ چیچ کراون، ئەو کڵێسایانەش دەتوانین بڵـێین وەکـو کڵێسـاکانی ڤینیسـیان زۆر لـەو کڵێسایانە تایبەت بە یارانی عیسان، هەروەك لە رۆژگاری دەسەڵاتی مەسیحی ئەمە نیشان دەدەن[1].

ئەولیا چەلەبی لەبارەی کڵێسا و رێورەسمی مەسـیحییەکانی ئامـەد لـەوە دواوە، ئێستەش کڵێساکانی ئەوێ وەکـو خـۆی مـاون و قەشـە و مـەتران و پەتریکـەکانیان باجیان لێ ناسەندرێ[2].

بازرگانی ناوبراو باسی ئەوەشی کردووە، کە کڵێسای جەرجیس پاك تـا ئێسـتەش یەکێك لەو چەکانەی تێدایە، کە مەسیحییە پاکەکان بە کاریـان هێنـاوە و خـۆی بـە چاوی خۆی دیویەتی، هەروەها گڵکۆی "دسپینا خاتوون"یش هەر لەو کڵێسـایەدایە، هەروەها باسی کڵێسای یەحیای پاکی کردووە، کە هێندە جوان چێ کراوە سەرسـامت دەکات، ئەمە و چەندین کڵێسـای دیکـە بـەو جـۆرە چـێ کـراون، لەوانـە کڵێسـای مەریەمی پاکیزە، کە شەست میحرابی هەیە، لەنێو کڵێساکەشدا چەندین گومەزی وا چـێ کـراون، پـتر لـە سـێ سـەد سـتوون رایگرتـوون، لەوێـدا سەرانشـۆ "غوسـلی تەعمید"چێ کراوە، کە سەری نـەگیراوە[3]، ئـەم کڵێسـایانە تـا سـەردەمی بازرگـانی ڤینیسیایی ماون، ئەگەر نا باسی دەکـرد، کـە کـراون بـە مزگـەوت یـاخود ئێسـتە شوێنەواریان ماوە، چونکە هەر کڵێسایەك کرا بێ بە مزگەوت ئەو ئاماژەی پێـداوە، لەبەرئەوە هەر لەبارەی کڵێسای مەریمی پاکیزەوە گوتویەتی لەم رۆژانەدا ئەو سەردەم لای رۆژهەڵاتی کڵێساکەیان کردۆتە مزگەوت، هەرچی بەشەکەی دیکەیـە وەك باسـم

---

1 - Ibid, p. 146

٢ - ل٣٣

3 - Ibid, p. 147.

کرد، ئێستە قەشەکان لێی دەژین، کانیاوی جوان و رەوانی تێدایە، کڵێساکە هێندە مەزن و بڵند و دڵفێنە، هەر دەڵێی بەهەشتە، بەردەکاتنی یەکجار جوانن، ستوونەکانی هێندە زۆرن، ژماردنیان سەختە، زۆر لە کڵێسای سان مارکو (مەرقوسی پاکی ڤینیسیا دەچێ[1].

ئەولیا چەلەبی لەبارەی پەرستگەکانی ئامەد گوتویەتی لە ناوەڕاستی شاردا پەرستگەی کۆن و مزگەوتی مەزن هۆی شانازی ئامەد (مزگەوتی گەورە)یە، مزگەوتی گەورە لە سەردەمی (موسا پێغەمبەر) بنیات نراوە، یەکێك لە کۆڵەگە سپیەکانی ژووری بەعیسری لێی نووسراوە، ئەم قەڵایە کەوتبێتە دەستی هەر کەس ئێرە هەر بە پەرستگە ماوەتەوە نوێژی لێ دەکرێ[2]. وەك پێدەچێ ئەولیا چەلەبی لەگەڵ ئەوەی باسی کردووە کە پەرستگەیە، بەڵام لە ریزی مزگەوتەکانی ئامەد باسی کردووە، کە هەر کەسی دوو رەکات نوێژ لێرە بکات، دڵی خەبەر لێی قبووڵ کردووە، لەوەش دواوە کە گەلێك نیشانەی وا هەیە دەیسەلمێنێ کە کڵێسا بووە و کراوە بە مزگەوت، منارە چوار گۆشەکەی دیارە کە لە پێشدا بۆ زەنگخانە دروست کراوە، مینبەر و میحرابەکەی شێوەی کۆنە، ناوەوەی بە چلچرا و قەندیل رازاوەتەوە، کۆڵەکەی ورد و درشتی هەن، کە سێ نهۆم لەسەریەك دانراون[3].

وەنەبێ هەر تەنیا بە کڵێساکان سەرسام بوو بێت، بگرە بە هەمان شێوە سەرسامی خۆی بۆ مزگەوتیش دەربڕیوە ئەوە نەبێ بە وردی باسی نەکردووە، لەبارەی مزگەوتی ماردین گوتوویەتی لەناو شاردا کۆشك و مزگەوتی جوانیان دروست کردووە[4].

لە باشی شاری ئارمناك گوتوویەتی دانیشتووانی هەمووی مەسیحی ئەرمەنین و یەك موسڵمانیش لەوێ بەرچاو ناکەوێ، گەلێ کڵێسای لێیە، هەمووی پەرستگەی

---

1 - Ibid, p. 147.سفرنامە ص٣٨٥

٢ - ل٤٠-٤١

٣ - ل ٤٤

4 - Ibid, p. 150.

ئەرمەنییەکانن، لەوانە کڵێسای حەزرەتی یەحیا، لە هەموو کڵێساکان گەورەترە و منارەکەی بە شێوەی بورج چێ کراوە هێندە بڵندە، دەڕوانێتە تەواوی شار، زەنگەکەی هێندە گەورەیە ، دەنگی دەگاتە گوێی هەمووان[1].

لە باشی شاری تەورێز باسی کردووە چەندین کۆشك بەرچاو دەکەون، کە لەنێو هەر کۆشکێکدا مزگەوتێك لەگەڵ گەرماوێکی سەربەخۆ هەن و مزگەوتەکانیان بەو جۆرە دروست کردووە، کە خەڵکی رووی تێ بکەن، لە هیچی کەم نییە، چەندین مزگەوتیان لەناو شاردا چێ کردووە، زۆر چاکیان بنیادناوە، مزگەوتی (عمارت عالی قاپو) زۆر گەورەیە بەشی ناوەڕاستیان نەگرتووە، لەو بەشەی موسڵمانان خەریکی پەرستنن، میحراب و تاقەکەی هێندە بڵندن، ئەگەر پتر هەڵباوێی ناگاتە میچی هێشتا ئەو بەشەش تەواو نەکراوە، بەشێکی زۆری لە بەردی بەنرخ چێ کراوە، مەڕمەڕەکانی زۆر روونن، ساف و لووس و جوانن، درێژاییان پێنج تا شەش پێ دەبێت، ئەو مزگەوتە سێ دەرگەی هەیە[2].

### ج. ئافرەت:

بازرگانی ناوبراو لەو هەموو شارە کوردییە گەڕاوە و ماوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی بە گشتیی باسی خەڵکەکەی کردووە، بەڵام سەرنجێکی وای لەبارەی ئافرەتەوە دەرنەبڕیوە، هەتا باسی خانەوادەی میرە کوردەکانیشی نەکردووە، تەنیا ئەوە نەبێ لەبارەی میری حەسنکێفەوە گوتوویەتی سوڵتان خەلیل لەگەڵ خالخون خاتوونی هاوسەری، کە خوشکی شا ئیسماعیلە لەنێو قەڵا ژیاون[3]، جێگەی سەرنجە ئەولیا چەلەبی لەبارەی ژنانی بەدلیسەوە دەبێژێت ژنیان زۆر بە نامۆس و جوان و نازەنینن نازانم رێگە دەدەن ئافرەتیان بێتە بازاڕ یان نا[4]؟!.

---

1 - Ibid, p. 160.٤٠٠ سفرنامە ص

٢ - ل٤٠٨

3 - Ibid, p. 152-153.

٤ -ل ١١٣

کەچی بازرگانی ڤینیسیایی تەنیا لە باسی شاری تەورێز باسی ئافرەتی کـردووە و دەڵێت بێ سەرپۆش دەتوانێ لە بازاڕ بسووڕێتەوە، بەو مەرجەی بـاج بـدا، لـە رووی رەنگیشەوە ئافرەتی ئەوێ، تەورێز، سپین، جلوبـەرگیان وەکـو جلوبـەرگی ئێرانییانـە سینەیان والآیە، تەنانەت جلوبەرگی پیاوانیش لەبەردەکەن، سەرباری ئەمانـە زۆر بـە خراپی باسی ئافرەتی تەورێزی کـردووە، کـە لـە راسـتیدا ئـەم باسـکردنە دوورە لـە راستییەوە، چونکە باسکردنی ئافرەت بەو جۆرەی کە داوێن پاك نەبن، بەهیچ جۆرێك کارێکی بابەتییانە نییە و روانینێکی هەڵەیە[1].

## د- چەند سەرنجێکی دیکە:

بازرگانی ڤینیسیایی لەگەڵ ئەوەی باسی ئەو میرە کوردانەی کردووە کە جێگـەی سەرنجی بوون، کەچی باسی هەندێ بابەتی کات بەسەربردنی نـەکردووە، کـە میرانـی کـورد خـەریکیان بـووە، رەنگـە ئەمـە پێوەنـدیی بـەوەوە هـەبووبێ لـە نێزیکـەوە نەیناسیون، ئەوەتا لـەبارەی راووشـکارەوە دواوە، کـە شـا ئیسـماعیل بڕیـاری داوە کۆشك لە شاخی ئەو ئاژەڵانە چێ بکەن، کە لە راووشکار دەیانکوژێ، لێهاتوویی لـە ڕاودا مەزنایەتیی شا ئیسماعیلی نیشان داوە و کۆشکانیش لە تەورێزی پایتەخت لـە شاخی ئاژەڵ سازکراون تا خەڵکی بیبینێ[2]. هەروەها شـەرەفخانیش لـەوە دواوە کـە میرانی کورد بۆ کات بەسەربردن خەریکی راووشکار بوون و ئەم کارەیان بۆیە ئـەنجام داوە بـۆ ئـەوەی لێهاتوویـیـان لـە سـێرەگرتن و ڕاو تـاقی بکەنـەوە، نـەك لـە رووی ئابوورییەوە سوودی لێ وەرگرن وەکـو ئـەو کـارەی راوچـی خەریکییـەتی[3] هـەروەها ئەبوبەکر تارانیش باسی لەوە کردووە ئەسکەندەری کوڕی قەرە یوسـف لەگـەڵ مـیرە کوردەکان بۆ ڕاووشکار دەچوو[4]

---

1 - Ibid, p. 168-172..، بڕوانە سفرنامە پەراوێزی ژمارە ٤ ص٤١٢

2 - Ibid, p. 164-166.

٣ - الشرفنامة مصطفى احمد النجار ص٢١٩-٢٢٠

٤ - دیاربکرییە ل١١٩.

لەبارەی خواردنیشەوە باسی ئەوەی کردووە، کە گوندنیشانی کورد، میوە و نـان و خواردنی ئاسایی رۆژانەیان هەیە[1]، دیارە ئەو میوە و دانەوێڵانەی هەن، هـەر ئەوانـە بۆ خواردن سازدەکەن، کەچی لە باسی شاری تەورێز گوتویەتی، زۆرینەی خەڵکەکـەی هەموو گۆشت دەخۆن، بەتایبەتی گۆشتی مەڕ، کە زۆر بە تام و ناسـکە بەلایانـەوە، بەڵام گۆشتی گا زۆر ناخۆشە، خەڵکی زۆر کـەم دەیخـۆن، ماسیسـش لێـرە زۆرە، لـە دەریاچەیەك کە رۆژە رێیەك دەبێ، لەوێ دەیهێنن، بوونێکی نا جۆری هەیە، هەروەها میوەیەکی زۆر دەخۆن، سەرباری زەیتون، کە زۆر بە تامە، هـەروەها لـە تـەورێز زۆر گیای لێیە، لەوانە چەندان جۆر سەوزە و کەلەم و پیـاز و...هتـد، سـەرباری بـرنج و دانەوێڵە [2]. هەروەها لە چاپتەری هەژدەدا باسی نەورۆزی کردووە و ناوی هێناوە، کە شا ئیسماعیل تا نەورۆز، واتە ساڵی نوێ لە کۆشکەکەی لە خوی ماوەتەوە، دواتر بۆ شەڕی پاشماوەی ئاق قۆیۆنلو رووی لە بەغدا کردووە[3].

---

1 - Ibid, p. 155-156.

2 - Ibid, p. 170-172.

3 - Ibid, p. 197.

## أ. دابینکردنی ئاو:

یــەکێك لــەو ســەرنجە گرینگانــەی بازرگــانی ڤینیســیایی لــە گەشــتنامەکەیدا دەریخستووە، پرسی دابینکردنی ئاوە، بــە پلــەی یەکــەمیش دابینکردنــی ئــاو وەکــو سەرچاوەیەکی بژێوی ژیان باسی لێوە کردووە.

سەبارەت بە گوندنشینانی دەوروبەری قەڵای جەمەلەین دەبێژێت: "کە ناوچەیەکی هەژارە و وشك و برینگ و بێ ئاوە، بەڵام لە ئەشکەوتەکانی چیا حــەوزی مــەزنیان هەڵکۆڵیوە و لە بەهار پڕی ئاو دەکەن و لە تەواوی ساڵ بەکاری دەهێنن"[1]. هەروەها لەبارەی شاری ئامەدەوە باسی ئەوە دەکات،کە ئــاوی گــەلێ زۆرە، لەبەرئــەوە گــەلێ کانی و سەرچاوەی لێ هەڵقوڵاوە، هەندێکی لــەنێو شــارە و هەنــدێکی لــە دەشــتە و هەندێکی لە کێوەکانە و بەگشتی پڕە لە سەرچاوە، لەو شارەدا کۆمەڵێ رووبــار بــەو شارەدا تێدەپەڕن، لە بەهاران دا بە شێوەیەکی سەرسامکەر و خێرا ئاو هەڵدەکشــێ و بەرەو حەسنکێف و جزیــرە دەڕوات، ئــەولیا چــەلەبی زۆر بــە وردی لــە سەرچــاوە و رووبارەکانی شاری ئامەد دواوە، لە باسی کانیاوەکــانی باســی لــە کانیــاوی (عــەین حەمرە و عەین عەلی ) و ئاوی کانی قەڵاتی نیوە کــانی چــوار بــەردە و کــانی درزی پیرێژن. لەبارەی کانی چوار بەردە دەبێژێت:"ئاوەکەی ئەوەندە ساردە، کــەس نــاتوانێ چوار بەردی یەك لە دوای یەك لەنێو ئاوەکــە دەربێنــێ، بۆیــە نــاوی چــوار بــەردەیان لێناوە، ئەو ئاوە پاکە لای مەیدانی نسوح پاشا بە بن دیواری قەڵا دەڕوات...لەبارەی سەرچاوەی رووبارەکانیشەوە باسی لە شەتول عەرەب و دیجلە کردووە، نێوانیان لەگەڵ فورات نێزیکەی پەنجا تاکو هەزار فرسەخە، کە لە چیاکانی دیاربەکرەوە هەڵدەقوڵێن، کە چوار سەرچاوەیان هەیە. لــەبارەی ئــاو خواردنەوەشــەوە دەڵێــت: "ئــاوی حــەمرە یەکجار بە ئاسانی هەرس دەکرێ، ئاوی شەتیش بــۆ خۆشــی و پــاکی بــێ وێنەیــە و هەموو جۆرە نەخۆشییەکی سینگ و دەغەزێك لەنێو دەبات، لە زستاندا ســەهۆڵێکی بلورینی هەیە[2].

---

1 - Ibid, p.145.

٢ - ل٤٦-٤٧. ل٥٢-٥٣. ل٦٢.

بازرگانی ناوبراو بۆ دابینکردنی ئاو لە شاری ماردین باسی لەوە کردووە، ئـاو بـە گوێرەی پێویست نییە، چونکە ئاوی ئەم ناوچەیە سوێرە، بەڵام لـە راسـتیدا جێگـەی سەرسوورمانە باوەڕ بەوە بکرێت، ئاوی ماردین سوێر بێت، چونکە چەند ساڵێك بـەر لەوە ئەبوبەکر تارانی مێژوونووسی دەرباری ئاق قۆیۆنلـو باسـی لـەوە کـردووە، کـە ماردین و دەوروبـەری مەڵبەنـدێکی تـژی بـەپیت و فـەڕی دانەوێڵـە و میوەجاتـە و دەشتەکەشی جێگەی سەرسوڕمان بووە[1]، لەبەرئەوە ناکرێ ئاوی ماردین سوێر بێت.

ئەولیا چەلەبی لەبارەی جزیرە دەبێژێت: "بەر لەوەی خودای مەزن ئەم دنیایە چـێ بکات، ئەم جزیرەیە ئاوەدان بووە و بەهەشتێکە لە نێوان شەتولعەرەب و فوراتدا[2].

هەروەسا ئەولیا چەلەبی لەبارەی ئاوی قەڵای ماردینەوە دەڵێچت: "لەنێو قـەڵادا گەلێك ئەشکەوت و کەلێن و قوژبنی هەیە، ئاویشی بەشی دە سـاڵی خـۆی تێدایـە، هەر بارانێك لە ئاسمان بێتە خوارێ، ئاوی سەر بەرزایی و لووتکـەکانی چـۆڕێکی بـە خۆڕایی ناچێت، بگرە هەمووی بە جۆگە بەردینەکانیدا دێتە نێو ئەمباراوەکانی[3].

لەبارەی حەسنکێفەوەش باسی لەوە کردووە، سەرباری ئەوەی سـوودیان لـە ئـاوی رووبار وەرگرتووە، هەروەها لە ئەشکەوتیش حەوزیان هەڵکەندووە تا ئاوی تێ بکەن، شەرەفخانیش لە ئاوی سازگاری حەسنکێف دواوە[4].

ئەولیا چەلەبی باسی کردووە، ئەو زێیەی لە دیاربەکرەوە (ئامەد) دێـــتە خـوارێ بە حەسنکێف تێدەپەڕێ[5].

بازرگانی ڤینیسیایی ئەوەندەی لە بەدلیس ماوەتەوە سـەرنجی داوە، شـارێکی پـڕ ئاوە، لە قەڵاکەشی دا کانی هەیـە، بـەڵام بـە گـوێرەی پێویسـت نییـە، هەرچـەندە بەسیانە لەگەڵ ئەمەش لە زستان بەفر هەڵـدەگرن و ئـەنباری دەکـەن و لـە هاوینـدا

---

1 - Ibid, p.147,148,150 .ابوبكرالگهراني:المصدر السابق،ج١،ص٥٥،٢٥٥،ج٢،ص٢٦٣،١٠٥

٢ - ل٦٩

٣ - ل٧٣

4- Ibid, p.154-155.

٥ - ل٨٨

بەكاری دێنن، لە راستیدا شەرەفخان سەبارەت بــە ســەرەتای ئــاوەدانی لــە بــەدلیس باسی رووبار و كانییەكەی و ئاوە سازگارەكەی كردووە[1]، لــە باســی قــەڵای وان لــەوە دواوە، كانییەك هەیە  هەموو دانیشتووانی قەڵا سوودی لێ وەردەگرن[2].

ئەولیا چەلەبی لەبارەی رووبار و كانیاوەكانی باسی كردووە، كە لــە بــەدلیس بــە شێوەی ئاودار و جۆگەلەوە بیست كانیاوی هەیــە، جگــە لەمانــە لــە هــەموو دۆڵ و شیوەكانیشی كانی هەڵدەقوڵێن، ئەم كانیاوانە زۆر گەورە نین[3].

## ب . تەندروستی:

هەرچەندە بە شێوەیەكی كورت باسی لە هەندێ لایەنی تەندروستی كردووە، بەڵام ئەم سەرنجە گرینگەی پێداوین، لەو سەردەمەدا گرینگیــان بــە جــۆرە تەندروســتییەك داوە، كە بە بیروباوەڕی ئاینی تێكەڵ بووە، باســی لــە نەخۆشــی گــەڕ و گــولی و تــا كردووە، لە شاری ئورفە هەم موسڵمان و هەم مەسیحییەكان كــانی ئیبراهیمیــان بــە پیرۆز زانیوە و ماسییان تێدا نەگرتووە، چونكە باوەڕیان وا بووە، ئەو  كەسەی تــادار بێت، بە بڕواوە خۆی بخاتە نێو كانییەكە چاك دەبێتەوە، لەبەرئەوە ئەو كانییەیان زۆر لەنك پیرۆز بووە، هەروەسا شەش میل لە دەرەوەی شار كانییەكی دیكە هــەبوو، كــە نەخۆشانی گەڕ وگولیی چاك كردۆتەوە، بەو مەرجەی بیماران بە باوەڕەوە بچنە نێوی، سەرەتا دەبێ پێنج رۆژ بە رۆژوو بن و ئاوی زۆر بخۆنەوە و خۆیان بە ئــاوی كانییەكــە بشۆنەوە، دواتر نابێت پێنج رۆژی دیكە خۆیان بشۆن، پاشان ماوەی دە تا دوازدە رۆژ ئاوی ئەو كانییە بخۆنەوە یاخۆ چاك دەبن، یاخود بە توندی نەخۆش ناكەون[4]، لەمــەوە بۆمان دەردەكەوێ بۆ چارەسەری نەخۆشی پەنایان بۆ ئەو كانییە بردووە، كە لــە بــڕوا بوونیانەوە سەرچاوەی گرتووە.

---

1 - Ibid, p.158 البدلیسی: المصدر السابق: ص٣٠٨

2 - Ibid, pp.161-162.

٣ - ل١١٧

4 - Ibid, p. 144.

هەروەها باسی لەوە کردووە، کە لە تەوریز لە دەوروبەری بالآخانەی ئوزون حەسەنی سەرداری ئاق قۆیۆنلو، سەرەڕای مزگەوت نەخۆشخانەیەك چێ کراوە، کە کەلوپەلی پێویستیی تێدایە و گەلێ مەزنە و لە مزگەوتەکەی تەنیشتی گەورەترە، لە ماوەی ئوزون حەسەن و یەعقوبی کوڕی هەزاران خەڵکی بێنەوا لەو نەخۆشخانەیە بوون و زنجیرەکانیان تا سەردەمی یەعقوبیش پاراستبوو[1]، گومان لەوەدا نییە میرانی کوردیش گرینگیان بە چێکردنی نەخۆشخانە داوە، بەتایبەتی میر شەمسەدینی رۆژەکی لە بەدلیس لە گەڕەکی کۆك مەیدان نەخۆشخانەی چێ کردووە[2].

لەبارەی سەرنجی بازرگانی ڤینیسیایی بۆ دابینکردنی ئاو و تەندروستییەوە بۆمان دەردەکەوێ: -

یەکەم:- زۆر گرینگی بە دابینکردنی ئاو بۆ خواردنەوە داوە و ئەو دابینکردنانەی باس کردووە، کە لە وڵاتی خۆیدا نەبوون، بەتایبەتی هەڵگرتنی ئاو و ئەنبارکردنی بۆ وەرزی هاوین.

دووەم:- سەرباری ئەوەی بیروباوەری خەڵکانی لە رووی تەندروستییەوە دەرخستووە بە تایبەتی لە ئورفە، هەروەها باسی نەخۆشخانەشی کردووە.

---

1 - Ibid, p.173.178.

٢ - البدليسي:المصدر السابق،ص٦٢٣.

# ئەنجام

دەکارین بەرئەنجامەکانی باسەکە لەم خاڵانەدا بخەینەڕوو:

١- بازرگـانی ڤینیسـیایی لـە ماوەیـەکی هەسـتیاردا سـەردانی کوردسـتانی کـردووە، گەشتەکەی بە پلەی یەکەم بە مەبەستی بازرگانی بووە، کەواتـە دەکـارین بێـژین درێـژەی ئـەو گەشتانەیە، کە باڵوێز و بازرگانانی ڤینیسیایی بۆ کەمکردنـەوەی گوشـاری دەوڵـەتی عوسمـانی دەهەمبەریان، بۆیە هاتوونەتە کوردستان و ئێران.

٢- بازرگـانی ڤینیسـیایی روونـی کردۆتـەوە لـە رووی موسـڵمانییەتییەوە، کـوردان لـە نەتەوەکانی دیکەی ئێرانییان موسڵمانترن و پتر بە بـاوەڕی ئیسـلامەوە پابەنـدن، لـە سـەرەتادا میرە کوردەکان لەبەر بانگهێشتی شا ئیسماعیلی سەفەوی روویان لێ نا و بە رووکـەش کـڵاوی سووریان لەسەر دەنا، بەڵام لە دڵەوە کورد لەگـەڵ سـەفەوی نـەبووە، مـیرە کوردەکـانیش ئـەم هەنگاوەیان وەکو سیاسەتکردن ناوە، بگرە خەڵکەکەشی مەزهەبی سەفەوییان قبووڵ نەبووە.

٣- بازرگانی ڤینیسیایی بە پێچەوانەی هاونشتمانییەکانی دیکەی، بە شـێوەیەکی ئـەرێنی باسی کوردی کردووە، لەگەڵ ئەوەی هاونیشـتمانەکانی تـەنیا بـە کوردسـتان تێپـەڕیوون، ئـەو ماوەیەکی باش لە کوردستان ماوەتەوە و بە چاوی خۆی بینیویەتی کوردستان تژییە لە تـەناهیی و ئارامی، لەگەڵ ئەوەی دەڤەرەکانی پڕ لـە شـاخ و هـەردن، بـەڵام دوورە لـە کـاری رێگـری و جەردەیی.

٤- میرە کوردەکان پاش رووخانی دەوڵەتی ئاق قۆیۆنلو توانیویانە خۆیان بـەهێز بکەنـەوە و دووبارە سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن، هەرچەندە شا ئیسماعیل سـەرەتا ویسـتویەتی بـە هـێمنی کۆنترۆڵیان بکات، کەچی ئەم سیاسەتەی سەری نەگرت، هەرچەندە خوشکی خۆی دا بە سـوڵتان خەلیلی میری حەسنکێف، دواجـار هێـزی لەگـەڵ بـەکارهێنان، بـەڵام نـەیتوانی بـە ئامـانجی سەرەکیی خۆی بگات.

٥- جوگرافیـای مێـژوویی کوردسـتان زیـاتر لـە نیـوەی تـەواوی ئـەم گرینگییـەی لـە گەشتنامەکەدا پێکهێناوە، کە برێتییە لـە ناسـاندنی قـەڵا و شـارە کوردییـەکان و پێکهاتـەی

کارگێڕی و دانیشتووانی باکوری کوردستان، زانیاریی ورد و زۆر گرینگی لەو بارەوە داوە و دەریخستووە میرنشینە کوردییەکان خودان سەربەخۆیی خۆیان بوون.

٦- لەرووی دانیشتووانەوە پێکهاتەی نیشتەجێیانی کوردستان بە پلەی یەکەم کوردبوون، پاشان مەسیحی و جوولەکە لێی نیشەجێ بوون و کوردستان مەڵبەندی پێکەوە ژیان و لێبوردن بووە.

٧- چالاکی بازرگانی لە کوردستان لە جموجووڵ دابووە، بە تایبەتی لەو شار و قەڵایانەی کەوتوونەتە سەر رێگەی تەورێز ـ حەلەب، کوردستانیش ئارام بووە و رێگەی بازرگانیش پارێزراوە، میرە کوردەکانیش کاروانسەرایان چێ کردووە، تا بازرگانان لێی بحەسێنەوە.

٨- بەشێوەیەکی فرەوان لە کوردستان میوە و میوەجات کراوە، هەروەها گرینگیش بە کشتوکاڵ دراوە، بۆ ئەوەش پشتیان بە رووبارەکان و سەرچاوە و کانییەکانی کوردستان بەستووە.

٩- لەتەك نەتەوەی کورد چەندان نەتەوە و پێڕەوانی ئاینی ئاینزایی دیکە لە شارە کوردییەکان ژیاون، هەر یەکەیان پەرستگەی تایبەتیی خۆیان هەبووە، موسڵمان لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتداربوون، کەچی ئازاری پێڕوانی ئاینی دیکەیان نەداوە، بازرگانی ڤینیسیایی بە شێوەیەکی ئەرێنی باسی لەمە کردووە، هەروەها باسی لە زۆرینەی کڵێسای ئەو شارانە کردووە، کە بینیویەتی و ماوەیەکی باش لێی ماوەتەوە، ئەو کڵێسایانەشی لەگەڵ کڵێسا ڤینیسیاییەکان بەراورد کردووە و بە جوانیی و قەشەنگیان سەرسام بووە، سەرباری ئەوەش باسی مزگەوتیشی کردووە.

١٠- بازرگانی ڤینیسیایی باسی جەژنی نەورۆزی کردووە، هەرچەندە بە شێوەیەکی کەم باسی کردووە، بەڵام ئەمە روونی دەکاتەوە، کە نەتەوەکانی ئێران یادی ئەو جەژنەیان کردۆتەوە.

١١- دانیشتووانی باکوری کوردستان بۆ دابینکردنی ئاو پشتیان بە چەند رێگەیەك بەستووە، لەوانە هەڵگرتنی ئاو و ئەمبارکردنی لە حەوزی گەورەی نێو ئەشکەوت و سوود وەرگرتن لە ئاوی کانی و رووبار، هەروەها هەڵگرتنی ئاو لەوەرزی زستان و بەکاربردنی لە وەرزی دیکە.

# سەرچاوەکان

**یەکەم: سەرچاوە:**

ابوبکر طهرانی: ابوبکر طهرانی الاصفهانی (وفاه بعد ٨٨٦ك/ ١٤٨٢ز)

ـ کتاب دیاربکریه، تصحیح: نجاتی لوغال و فاروق سومر، کتابخانه طهوری، طهران ١٣٥٦ ه.ش

البدلیسی: الامیر شرفخان بن شمس الدین بن شرفخان (ت ١٠١٠ه/١٦٠٣م)

ـ شرفنامه، ترجمه: محەمەد جمیل الملا الروزبیانی، مؤسسه موکریانی، اربیل، ٢٠٠١، گ٢ .

حەسەن روملو: حەسەن امیر سلطان روملو (وفاه بعد ٩٨٥ه/ ١٥٧٧م)

حەسەن التواریخ، به اهتمام: عبدالحسین نوائی، بنگاه ترجمه ونشری کتاب، تهران، ١٣٤٩ه.ش ج ١١.

ابن حوقل: ابو القاسم محەمەد بن علی النصیبی (ت ٣٦٧ه/ ٩٧٧م)

ـ صوره الارض، دار مکتبه الحیاه، بیروت، ١٩٧٩ .

فضل الله روزبهان خنجی: فضل الله روزبهان بن فضل الله خنجی الاصفهانی (وفاه ٩٢٧ ه/١٥٢٠م)

- تاریخ عالم ارای امینی، بەکوشش: مسعود شرقی، انتشارات خانواده، ایران ١٣٧٩، ه.ش.

یاقوت الحموی (شهاب الدین ابو علی عبدالله یاقوت بن عبدالله) (ت٦٢٦ ه /١٢٢٨م)

- معجم البلدان، قدم لها: محەمەد عبدالرحمن المرعشلی دار احیاء التراث العربی، بیروت، ١٩٩٧.

ـ سفرنامەهای و نیزیان در ایران (شش سفرنامه) ترجمه: منوچهر امیری، شـرکت سهامی انتشارات خوارزمی، چاپ دوم، ١٣٨١ ه.ش، تهران.
ـ ئەبوبەکر تارانی: کتێبی دیاربەکرییە، وەرگێڕانی: سەلاحەدین ئاشـتی، بنکـەی ژین،٢٠٠٧، سلێمانی، چاپ یەکەم.
ــ اسـکندر بـیگ ترکمـان: تـاریخ عـالم ارای عباسـی جلـد١، ، چـاپ گلشـن، تهران١٣٥٠ه.ش،ص٣١.
ـ ئەولیا چەلەبی : کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا و:ناکام،
- رحله الایطالي کاسبارو بالبی الی حلب —دیر الزور- عنه — الفلوجـه- بغـداد سنه ١٥٧٩: عربها عـن الایطالیـة و علـق علیهـا الاب د.بطـرس حـداد ٢٠٠٨، دار العربیة للموسوعات،
ـ شەرەفنامە و: هەژار

-MERCHANT of VINCE and others: A NARRATIVE of ITALIAN TRAVELS in PERSIA, Translated by Charles Gery, BURT FRANKLIN PUBLISHER, U.S.A, NEW YORK, N.D .



**دووەم: ژێدەر:**

- احمد عبـدالعزیز محمـود: الامـارة الهذبانیـة الكردیـة في ازربیجـان و اربیـل و..، موسسة موكریانی، اربیل،٢٠٠٢.
- ا.ل.س. لمتون: مالك و زارع در ایران، ترجمه: منوچهر امیری. بنگـاه ترجمـه و نشر كتاب، تهران، ١٣٤٠ه.ش ،چاپ دوم.
- جاسم مهاوي حسین: تاریخ الغزو التیموري للعراق و الشـام و اثـاره السیاسـیة ١٣٨٥- ١٤٠٥م رسالة ماجستیر (غ .م) جامعة بغداد،١٩٧٦.
- حسـام الـدین علـي النقشـبندی: ازربیجـان (دراسـة في احوالهـا السیاسـیة والحضاریة)، اطروحة دكتوراة (غ .م)، جامعة بغداد،١٩٨٤.

ـ حكيم احمد خوشناو: الكورد و بلادهم عند البلدانيين و الرحالة المسلمين (٢٣٢- ٦٢٥ه/ ٨٤٦- ١٢٢٩م) دار الزمان ، ٢٠٠٩.

- رابيعه فەتاح: كوردستان لە سەدەی پازدەی زایینییدا، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥.

- ستانلي لين بول: الدول الاسلامية، ترجمة: محەمەد صبحي فرزات، دمشق، ١٩٧٤.

ـ كورد و كوردستان لە نیگای چەند گەڕیدەیەكی رۆژئاواییەوە:وەرگێڕانی لە توركییەوە: شوكور مستەفا، دەزگەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠

- لسترنج: جغرافیای تاریخی سرزمین های خلافت شرقی مترجم:محمود عرفان،تهران، ١٣٨٣ ه.ش ، چاپ ششم .

- مصطفى احمد النجار: شرفخان البدليسي و منهجه التاريخي من خلال كتابه شرفنامه، دار سبيريز، مطبعة حاجي هاشم، اربيل، ٢٠٠٧.

- منوچر دانش پژوه: بررسی سفرنامەهای دورەصفوی، انتشارات. دانشگاه. اصفهان، فرهنگستان هنر، پایز١٣٨٥ ه.ش.

ـ میرێلا گەلێتی: كورد و كوردستان لە نووسراوەكانی ئیتالّی دا لە سەدەی (سێزدەم -نۆزدەزم) وەرگێڕانی: جاسم تۆفیق، پێداچوونەوەی: سەلاّح رێبوار، بنكەی هەنگاو بۆ بلاّوكردنەوەی رۆشنبیری كوردی، ستۆكهۆلّم، ١٩٨٧.

- محەمەد معین: فرهنگ فارسی، جلد دوم، موسسه انتشارات امیركبیر، تهران، ١٣٧٦ه.ش، چاپ یازدهم.

-نیشتمان بشیر: الكرد والسلاجقه، اطروحة دكتوراه، جامعه صلاح الدين، اربيل،٢٠٠٠.

ـ سفرنامه اوربيان به ايران، ژان شيبانی، ترجمه: سيد ضياالدين دهشيری، تهران ١٣٨٤ ه.ش، شركت انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ سوم.

ـ والتر هينس:تشكيل دولت ملی در ايران، ت: كيكاووس جهانداری چ چهارم ١٣٧٧ه.ش، تهران،انتشارات خوارزمی.

ـ هانس روبرت رویمر: ایران در راه عصر جدید (تاریخ ایـران از ۱۳۵۰-۱۷۵۰) ت: اذر اهنچی، انتشارات تهران، پاییز ۱۳۸۰هـ.ش،چ۱.
ـ محەمەد بایراقدار: ئیدریس بەدلیسی، وەرگێڕانی، شکور مستەفا، چاپی یەکەم، کوردستان،۱۹۹۹ز، چاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، کتـێبی سـەنتەری برایـەتی٤، ل١٤-٣٨.
ـ د. قادر محەمەد حەسەن: اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية(دراسة عـن دور الكرد الحضاري في مصر و بلاد الشام خلال عهـد المماليـك ، سـبيريز، ط١ن مصـبعة الحاج هاشم، اربيل ۲۰۰۹.
ـ: جيمز ا كوريك: رنسـانس، ترجمـه:ازيتا ياسـائى، تهـران ۱۳۸۸ ه.ش، چـاپ هفتم، انتشارات ققنوس.
ـ حيدر لشكري: الكرد في العرفة الاسلامية، دهوك.
ـ حسين مير جعفرى: تاريخ تيموريان و تركمانان، انتشارات دانشگاه اصفهان،
ـ منوچهر پارسا دوست: شاه اسماعيل اول، شركت سهامى تهران، ۱۳۷۵هـ.ش
دوريات:
- د. شـاكر خصـباك: الاكـراد في نظـر العلمـاء و الرحالـة الغـربيين. مجلـة شمـس كردستان. العدد (۲) حزيران ۱۹۷۰
- ميريلا غاليتي: التراث الكردي في مؤلفات الايطاليين، ترجمة: د. يوسـف حـبي، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عیراق (دەستەی کورد) ۱۹۸۱، بەغدا.

## پاشکۆ
## سەدەی شازدەیەمی زاینی
## نادیارێکی خەڵکی ڤینیسیایی

ئەم راپۆرتە بەسوودە لەلایەن بازرگانێکی نەناسراوی ڤینیسایی لە ساڵانی ١٥١٧- ١٥٢٠ز نووسراوە، لەو کاتەی بەدوای لەشکری شای ئێران "شا ئیسماعیل"دا بووە، خەریکی شەڕکردن لەگەڵ میری کارانیا Cara mania بوو. ئەو کابرایە سەردانی ماردین، وان و بەتلیس دەکات و باسی قەڵا و قوللەکانی شارەکان دەکات، هەروەسا باسی هەلومەرجی بازرگانی دەڤەرەکە دەکات. لەبارەی کوردانەوە دەبێژێت: (ملکەچی قبووڵ ناکەن و بە خراپی بەخێوکراون، ئەگەرچی کڵاو و جامانەی سوور لەسەر دەنێن، بەڵام لە دڵەوە سۆفی sophiani راستەقینە نین، تەنیا بەکڵاو و جامانە نەبێ. کوردان لەچاو میللەتانی دیکەی ئێران زۆرتر پابەندن بە ئیسلامەوە، بەڵام فارسەکان سەر بە ئاینزایەکی دیکەن بەناوی sophiana کوردان ناخوازن بچنە نێو ئەو ئاینزایەوە ئەگەرچی کڵاو و جامانەشیان سوورە، وا دیارە لەدڵەوە گوێ نادەنە رۆژی مردن. ل ٨٠ – ٨١) زۆرینەی کوردان سەر بە ئاینزای سونەن، بەشێکی کەمیشیان سەر بە ئاینزای شیعەن، پێڕەوی دروشمی Cuius region, eius et religio (واتە لە ئایندا پێڕەوی فەرمانڕەواکانیان دەکەن. لە سەدەی ١٦ز لە کاتی شەڕەکانی نێوان ئیمپراتۆری عوسمانی و ئێرانی، زۆرینەی کوردان پاڵپشتیان لە ئاینزای سونە دژی دەوڵەتی سەفەوی دەکرد. خاڵێك جێگەی بایەخ و سەرنجدانە ئەویش ئەوەیە، کە ئەو کابرایە لە بارەی کوردستانەوە دەبێژێت:

(ئەو ولاتە وەك شامی شەریف وایە، رێگری و دزی نییە، لەم ماوەیە لای ئەو (خان)ـە بووم، کەس شتێکی خراپی لەگەڵ نەکردم... ل ٨٠ب) هەروەها دەست نیشانی ئەوە دەکات، کە شا ئیسماعیل لە شکرێکی شەش هەزار کەسی رەوانەی سەر بەدلیس دەکات، بەڵام بە ماوەیەکی کەم ناچار دەبێ لەشکرەکەی بانگ بکاتەوە و بۆ بەرەیەکی دیکە رەوانەی بکات " ل ٨١") بەشێوەیەکی گشتیی ناوەڕۆکی ئەم باسە سوودبەخشە بەهۆی دەستنیشانکردنی چەند زانیارییەکی بەکەڵك تێیدا.

| **ناوی شار و قەڵا** | **سەرنجی بازرگان یان مانەوەی** |
| --- | --- |
| بیرە | ڕێگەی بازرگانی لەسەر ڕێگەی حەلەب. |
| ئورفە | شوێنی شوێنەواری نەمرود. |
| جەمەلەین | قەڵایەکە لە بەدلیس، ناوچەیەکی وشکە. |
| قەرە ئامەد | پیرەوانی هەموو ئاینەکان بە ئاشتەوایی دەژین و پـڕە لـە کلێسا. |
| ددو | سێ ڕۆژ لێی ماوەتەوە . |
| ماردین | لەسەر کێوێ هەڵکەوتوو، کۆشك و مزگەوتی جوانی لێیە. |
| جزیرە | هەر میوە و خواردنییەك بتەوێ دەست دەکەوێ. |
| حەسنکێف | شاری شاهان، دوو مانگ لێی ماوەتەوە.پردی حەسـنکێف سەرسامی کردووە. |
| ئایخو | قەڵایەکە، لەرووی ئیدارییەوە سەر بە حەسکێفە. |
| ساسۆن | قەڵایەکە، لەرووی ئیدارییەوە سەر بە حەسنکێفە. |
| ئەرزن | قەڵایەکە، لەرووی کارگێڕییەوە سەر بە حەسنکێفە. |
| سعێرت | فندق و گرێز زۆر بەکاربراون |
| کیفەندوور | یەك مانگ ماوەتەوە. |
| بەدلیس | پازدە ڕۆژ ماوەتەوە |
| تەدوان | دژێکە لەسەر کێوێ بەرامبەر دەریاچەی وان. |
| وستان | وێرانەیە بەدەستی سەفەوی. |
| وان | قەڵایەکە کورد و ئەرمەنیی لێن |
| پیگیری | قەلایەکە بەلای ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی وان. |
| ئابل گیریس | قەڵایەکە بەلای ڕۆژئاوای دەریاچەی وان. |
| ئەخلات | لە شوێنەواری دەردەکەوێ شارێکی گەورەیە. |
| ئەلاتامدیا | حوکمڕان و دانیشتووانەکەی تورکمانن. |

خوی		له کۆندا شارێکی گەورە بووە، شوێنی راووشکاری شا ئیسماعیلە.

تەورێز		پایتەختی ئاق قۆیۆنلو و شائیسماعیل.

مەرەند		له دەشتێکی جوان هەڵکەوتووە و شارێکی بچووکە و بازاڕێکی هەیە.

چەمووشگوزەك  بازرگانی ناوبراو بە قەڵاکەی سەرسام بووە.

ئەرزنجان	له دەشتێکی جوان هەڵکەوتووە، شارێکی گەورەیە.

توقات		شارێکی گەورەیە.

مەلاتیە	شارێکە سەر بە سوڵتانی قاهیرەیە، لەوێ (ئەڵوەند) دوا میری ئاق قۆیۆنلوی بە بەندکراوی دیوە.

سیواس		شارێکی گەورەیە.

ئارمناك	دانیشتووانەکەی هەموویان ئەرمەنین.

خەرپووت	ئوردوگەی شا ئیسماعیل.

حەلەب		ڕێگەی بازرگانی.

دیاربەکر	هەرێمی گەورەی سەر بە ئێران.

| میر یاخۆ دەسەڵاتدار | قەڵەمڕۆ یاخۆ دەسەڵاتداریێتی |
| --- | --- |
| عەلائولدەولە | ئامەد، ئورفە، خەرپوت |
| ئوستاجلو | فەمانڕەوای دیابەکر لەلایەن شا ئیسماعیل. |
| خەڵکەکەی | ماردین |
| حاکمێکی کورد | جزیرە |
| سوڵتان خەلیل | حەسەن کێفا و دەوروبەری (ئایخو، ساسۆن، ئەرزن). |
| قەنبەر بێگ | لەلایەن شا ئیسماعیل، ئەرزن. |
| میرێکی کورد | کیفەندوور |
| سیراج بەگ | بدلیس |
| زێدی بەگ | وان و دەوروبەری (لێدانی سکە و خوێندنەوەی خوتبە) |




**سنووری دەوڵەتی سەفەوی**



**شاری ئامەد**



مدينة الرها - اورفه

**ئورفه**



**شوورای شاری ئامەد**




**سنووری دەوڵەتی ئاق قویونلو**



**حسن كيفا**




**سنووری دەوڵەتی عوسمانی و  صەفەوی ساڵی ١٦٠٠ ز**



**پەیکەری شا ئیسماعیل لە (ئەردەبیل)**